ARAM
چاپەمەنی ئارام

پاولۆ کۆیلۆ

# لەکەناری روباری پیدرا دانیشتم و گریام




وەرگێڕانی
م.شریف حمه رشید

چاپی یەکەم
٢٠٠٦

به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

# له كەناری ڕووباری پیدرا دانیشتم و گریام

نوسەر: پاولۆ كۆئیلۆ

وەرگێڕ: شەریف حمەڕەشید

# له بڵاوكراوه‌كانی چاپه‌مه‌نی ئارام

**پێناسی كتێب**

ناوی كتێب : له كه‌ناری ڕووباری پیدرا دانیشتم و گریام

نوسه‌ر : پاولۆ كۆئیلۆ

وه‌رگێڕ : شه‌ریف حمه ڕه‌شید

نه‌خشه‌سازی :ئلرام محه‌مه‌د

چاپخانه :چاپه‌مه‌نی ئارام

تایپیست : سوریْن حمه ڕه‌شید

تیراژ :500وێنه

نۆبه‌تی چاپ :یه‌كه‌م

ژماره‌ی سپاردن :

# ژیان نامەی پاولۆ کۆئیلۆ

پاولۆ کۆئیلۆ لە سالی 1947، لە "Rio de Janeiro"ی بەرازیل هاتووەتە دنیاوە. پێش ئەوەی بە نوسەرێکی پڕ فرۆش ناوبانگ دەرکات، شانۆ نووس، دەرهێنەر، مۆسیقاری خەلکی بەرازیل بوو دوای ماوەیەك، بە ڕۆژنامەنوسی و شانۆ نوسی تەلەفزیۆنی دەست بە کار بوو.

پاولۆ لە سالی 1986 ڕێگەی زیارەتی ئسپانیا و شەقامی Santiago سانتیاگۆی بە پێ بڕی. لە دوایدا ئەم ئەزمونانەی لە کتێبێکدا بە ناوی "یادگارییەکانی پیرێکی موغان" ڕوونکردەوە کە لە سالی 1987 لە چاپ درا.

سالی دوایی، بە کتێبی دووەمی "کیمیاگەر" گۆڕا بە یەکێ لە پڕ خوێنەرترین نووسەرەکانی ئەو سەدەیە و کتێبەکانی لە بیست و نۆ وولاتی جیهاندا بلاوکرانەوە. بەگوێرەی گۆڤاری نێو دەولەتی "publishing trends"، کتێبی "کیمیاگەر" یەکێك بوو لە دە کتێبە پڕ فرۆشەکانی جیهان لە سالی 1988 دا. ئەم کتێبە تا ئێستا لە وولاتەکانی ئەرژەنتین، ئوسترالیا، ئوتریش، بەلجیکا، بەرازیل، بولغارستان، کەنەدا، کۆلۆمبیا، کرواتیا، فەرانسا، ئەلمانیا، ئێران، ئیتالیا، لاتویا، مەکسیك، نەرویج، لهستان، پورتوگال، پورتوریکو، سلواکی، اسلوانی، ئسپانیا، سویسرا، تایوان، ...کیا، اوروگوئە، یوغسلافیا، فەنزویلا دا یەکێك بووە لە پڕ فرۆشترین ... کان.

"کیمیاگەر" لە لایەن زانکۆی "شیکاگۆ"وە بە کتێبێکی وانەیی دانراوە و ئەو کتێبەیان بە دەست ڕەنگینی کەسێکی بەسوود زانیوە. هەروەها لە خوێندنگاکانی ئەرژەنتین، فەرانسا، ئیتالیا، پورتوگال، بەرازیل، تایوان، وولاتە یەکگرتووەکان و ئسپانیا، بە کتێبی وانە بێژی لەقەلەم دراوە.

کتێبه گشتگیره‌کانی تری ئه‌و بریتین له :

"Brida" ساڵی ( 1990 )،

"Valktub" ساڵی ( 1992 )،

"Maktub" ساڵی ( 1994 )،

" له که‌ناری ڕووباری پیدرا دانیشتم و گریام " ساڵی ( 1994 )،

"کێوی پێنجه‌م" ساڵی ( 1994 )،

"Second Maktub" ساڵی ( 1997 )

"یاداشته‌کانی جه‌نگاوه‌ری نور" ساڵی ( 1997 ).

ڕۆمانی "ورونیکا بڕیاری داوه بمرێت"، داستانی ئه‌ویننداری و جنون، له ساڵی 1999 بڵاوکرایه‌وه و له زۆربه‌ی وولاته‌کاندا، له‌وانه فه‌ره‌نسا و ئێران، چوویه ڕیزبه‌ندی پڕ فرۆش ترین کتێبه‌کانی جیهان. ئه‌و له ساڵی 2000 دا ڕۆمانی " شه‌یتان و خانم پریم" نوسی که به‌م زوانه بڵاوده‌کرێته‌وه.

کتێبه‌کانی ئه‌و له زیاتر له 120 وولاتدا بڵاوکراونه‌ته‌وه و وه‌رگێڕراونه‌ته سه‌ر 46 زمان. زیاتر له بیست و حه‌وت ملیۆن نوسخه له کتێبه‌کانی فرۆشراون و به‌گوێره‌ی گوزارشته‌کانی بڵاوکراوه‌ی "Lire" له مانگی مارسی ساڵی 1999، ئه‌و دووه‌می نووسه‌ری پڕ فرۆشی جیهان بووه له ساڵی 1998.

"پاولۆ کۆئیلۆ" خه‌لاتێکی ئه‌ده‌بی زۆری له زۆربه‌ی وولاته‌کاندا به ده‌ست هێناوه. ڕه‌خنه‌گره چالاکه شاعیرانه‌کان ستایشی ( واقعیه‌ت ) بیرسا و فه‌لسه‌فه‌کانیان ده‌کرد .

# خەڵاتە شانازییە ئەدەبییەکانی پاولۆ کۆئیلۆ

Prix Lectrices d Elle — فەرەنسا، 1995

Knight of Arts and Letters — فەرەنسا، 1996

Flaiano International Award — ئیتالیا، 1996

Super Grinzane Cavour Book Award — ئیتالیا، 1996

Golden Book — یوغسلافیا، 1996

Finalist for the International IMPAC Literary Award — ئیرلەندا، 1997

Comendador de Ordem do Rio Branco — بەرازیل، 1998

Crystal Award — ئەنجومەنی جیهانی ئابووری، 1999

Golden Medal of Galicia — ئسپانیا، 1999

Chevalier de L Ordre national de la Legion dhonneur — فەرەنسا، 2000

Crystal Mirror Award — ئۆستان، 2000

# له كەنارى ڕووبارى پيدرا دانيشتم و تێر تێر گريام

دانيشتم و تێر تێر گريام. بەگوێرەى ئەفسانە، هەرچييەك بكەوێتە نێو ئاوى ئەم ڕووبارەوە ـــــ گەڵا، حەشەرات، پەڕى باڵندەكان ـــــ لەسەر ڕووى ئاوەكە دەبيەستێت و دەبێت بە بەرد. ئاخ، بريا دەمتوانى دڵم لە سينە بهێنمە دەرەوە و بيخەمە نێو ئەم ئاوەوە، ئيتر لە دواى ئەوە نە ئازارێك بوونى دەبوو و نە خەم و خەفەتێك و نە يادەوەرييەك.

له كەنارى ڕووبارى پيدرا دانيشتم و تێر تێر گريام. بەهۆى سەرماى زستانەوە، هەستم بە فرمێسكەكان دەكرد لەسەر ڕووخسارم، وە فرمێسكەكان تێكەڵ بە سەهۆڵبەندانەكە دەبوو كە لەسەر ڕوخسارمدا جۆگەلەى هەڵبەستبوو. شوێنێك، ئەم ڕووبارە بە ڕووبارێكى تر دەبەستێتەوە، دواى بە ڕووبارێكى تر، هەتاوەكو ـــ دوور لە دڵ و چاوانى من ـــ تەواوى ئەم ئاوانە بە دەريا بگەن.

با فرمێسكەكانم، هەر بەم شێوەيە، تا شوێنێكى دوور دەست جۆگەلە هەڵبەستن، تا ئەوينم هەرگيز نەزانێت كە ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ ئەو گرياوم. با فرمێسكەكانم تا شوێنێكى دوور دەست بڕۆن، تا لە دوايدا ڕووبارى پيدرا، و پەرستگا، كەنيسەى پيرنە، مانگ، و ڕێگەيەك كە پێكەوە برِيومانە لەبير بەرمەوە.
ڕێگەكان، كێو و دەشتەكان و خەونەكانم لەبير بەرمەوە ـــــ ئەو خەونانەى كە هى من بوون، ئەو خەونانەى كە نەمدەناسين و ئامۆ بوون بە من.

ئەم داستانەم لە کەناری ڕووباری پیدرادا نوسی. دەستم بەسڕینەوەی فرمێسکەکانم... پێی بە خەوتووەکانم ... کەوایە با دەست لە نوسین هەڵگرم.

وتی: (هەوڵ بدە بژیت. یادەوەری هی پیرە پیاو و پیرە ژنەکانە. )

لەوانەیە ئەوین پێش وەخت پیرمان بکات، وە کاتێ لاوێتیمان بۆ بگەڕێنێتەوە کە ئیدی دەورانی لاوێتی بەسەر چوو بێت. بەڵام چۆن ئەو ساتانە بەبیر خۆم نەهێنمەوە؟ هەر بۆیە دەنوسم، تا خەم و خەفەت بە دڵتەنگی و تەنیایی و یاداوەری بگۆڕمەوە. چونکە، کاتێك ئەم داستانە بۆ خۆم تەواو دەکەم، دەتوانم بیخەمە ناو ڕووبارەکەوە ــــ ئافرەتێك کە منی پەنا دابوو، ئاوای ووت. دوایی ــــ بە ووتەی فەشەیەکی مەسیحی ــــ ئاوەکان دەتوانن ئەوەی کە بە ئاگر نوسراون، بیکوژێننەوە.

هەموو داستانە ئەوینداریەکان هاوتا و یەکسانن.

منداڵی و لاوێتیمان پێکەوە بەسەر برد، دوایی ڕۆشت، هەر بەو شێوەیەی کە هەموو لاوانی شارە بچووکەکان دەڕۆن. ووتی دەڕوات جیهان بناسێت، وە خەونەکانی ڕوو بە دەشتەکانی سوریایە.

چەند ساڵێك بەم شێوەیە تێپەڕی. هەر ساتێك و نامەیەکم پێدەگەشت، بەڵام هەموو نامەکان هەر هی ئەو بوون ــــ چونکە ئەو هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ دارستانەکان و شەقامەکانی منداڵیمان.

کاتێ وانەکانم تەواو بوون، ڕۆشتم بۆ Zaragoza و گەشتمە ئەو ڕایەی کە ئەو مافی خۆیەتی.

سوریا شارێکی بچووك بوو، تەنها شاعیرە بەناوبانگەکەی دەیووت: ڕێگا بە بڕین دروست دەبێت. چوومە نێو زانکۆوە و دەستگیرانێکم بۆ خۆم هەڵبژارد. دەستم بە دەرس خوێندن کرد بۆ بەشداری کردنم لە تاقیکردنەوەیەکدا تا کارێکی دەوڵەتی بگرمە دەست، کە هەرگیز نەمتوانی. لە ڕێگەی کارکردنەوە

وەکو فرۆشیارێك، ساڵانەی زانکۆم گرتە دەست. لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو نەبووم، دەستگیرانیەکەشم شێواند.

لە دوای ماوەیەك، نامەکان زیاتر دەبوون و پولی وولاتە جیا جیاکان لەسەر ڕووی نامەکان، ئیرەییان زیاد ئەکردم. لە من گەورە تر بوو، هەموو شتێکی دەزانی، بە دەوری دنیادا دەگەڕاو پەل و پۆی دەهاویشت، بەلام من هەوڵم دەدا ڕەگ و ڕیشە داکوتم.

لە دێرێکدا ماوەیەك لەمەوپێش، لە نامەیەکدا باسی خودای دەکرد، نامەکان هەمیشە لە شوێنێکی دیاری کراوەوە لە فەرەنساوە دەهاتن.

لە یەکێ لە نامەکاندا، بە ڕوونی و ئاشکرایی نووسی بووی کە حەز دەکات بچێتە پەرستگایەکەوە و ژیانی بۆ عیبادەت کردن تەرخان بکات. وەلامی نامەکەیم دایەوە و داوام لێکرد کە پەلە نەکات و ئارام بگرێت، و پێش لەوەی بە بەرپرسیاریەتیەکی قورس ڕازی بێت، کەمێك زیاتر چێژ لە ئازادییەکانی وەربگرێت.

کاتێ نامەکەمم خوێندەوە، بڕیارمدا بیدڕێنم: ئەوە منم دەمەوێ سەبارەت بە ئازادی و لێپرسراوی بۆی بدوێم !؟ ئەو بوو کە ئەم شتانەی دەزانی، نەك من.

ڕۆژێکیان بیستم کە ووتاریش دەدات. سەرسام بووم، لاو تر لەوە بوو کە بتوانێت شتێك فێری کەسێك بکات. بەلام، هەر دوو هەفتە لەمەوپێش، کارتێکی بانگهێشتی بۆ من نارد و ووتی بڕیار وایە لە شاری مەدرید بۆ کۆمەڵێکی کەم ووتار بدات و خوازیاریشە کە من ئامادەی کۆنفرانسەکە بم.

چوار کاتژمێر لە Zaragoza تا مەدرید ڕێگام بڕی، چونکە دەموویست بیبینم، دەموویست گوێم لە دەنگی بێت. دەموویست لە مەیخانە لەگەڵیدا دانیشم و ئەو ساتانە بێنینەوە یادی خۆمان کە پێکەوە یاریمان دەکرد، وە وا بیرم دەکردەوە کە دنیا گەورەتر لەوەیە کە بتوانی بیبڕیت.

*شەممە*

## 1993/12/4

کۆنفرانسەکە لە شوێنێکی تایبەتی تر لەوە بوو کە من بیرم لێدەکردەوە، ژمارەی ئامادەبووانیش زۆر لەوە زیاتر بوو کە من گومانم دەبرد. نەمدەزانی کۆنفرانسەکە لە چ ڕوانگەیەکەوەیە.

وامزانی: ( کە دەزانێت، ناوبانگی دەرکردووە. ) لە نامەکانیدا شتێکی ئەو تۆی بۆ نەنووسی بووم. حەزم دەکرد لەگەڵ ئامادەبوواندا بدوێم، بپرسم لێرە چی دەکەن، بەڵام نەمدەوێرا و جورئەتم نەدەکرد.

کاتێ هاتە ژوورەوە، سەرسام بووم. لەگەڵ ئەو کوڕە بچووکەی کە دەمناسی جیاوازی هەبوو ــــ بەڵام هەڵبەتە، لە ماوەی یانزە ساڵدا، مرۆڤەکان دەگۆڕێن. سەرنج ڕاکێش تر بوو بوو، چاوەکانی دەدرەوشانەوە.

ژنێک لە پەنامدا ووتی: ( ئەو شتێک کە هی ئێمەیە، بۆ ئێمەی دەگەڕێنێتەوە. )

پرسیارم کرد: ( چی بۆ ئێمە دەگەڕێنێتەوە ؟ )

ــــ ( شتێک کە لە ئێمەیان دزیوە. ئاین. )

ژنێکی لاو تر کە لە لای ڕاستمەوە دانیشتبوو، ووتی: ( نەخێر، شتێک بۆ ئێمە دەگەڕێنێتەوە. ناتوانێت شتێک کە هی ئێمەیە، بۆ ئێمەی بگەڕێنێتەوە. )

ژنی یەکەم، پرسیاری کرد: ( کەوایە تۆ لێرە چی دەکەیت ؟ )

ــــ ( دەمەوێ گوێ بۆ ووتەکانی ڕادێرم. دەمەوێ بزانم چۆن بیر دەکاتەوە، چونکە پێش لەمە ڕۆژێک ئێمەیان سووتاندووە، دەتوانن دووبارە ئەم کارە بکەنەوە. )

ژنەکە ووتی: ( ئەو تەنها دەنگێکە. تەنها بەگوێرەی توانای ئاکە کەسی خۆی شتی لە دەست دێت. )

ژنە لاوەکە زەردەخەنەیەکی ئانە ئامێزی کرد و ڕووی وەرگێڕا و ووتووێژەکەی پچڕاند.

ژنەکە درێژەی پێدا: ( بۆ هەر داواکارییەك ڕەفتارێکی لێهاتووانە هەیە. ) ئەم جارەیان ڕووی لە من کرد، وەك ئەوەی پەسەند کردنی ووتەکەی بووێت.

من هیچ تێنەدەگەشتم، بێدەنگ بووم و ژنەکەش بێدەنگ بوو. ژنە لاوەکەی تەنیشتم چاوێکی لێداگرتم ـــ وەك ئەوەی کە پشتگیریم لە ئەو کردبێت.

بەڵام من لەبەر هۆیەکی تر بێدەنگ بووم. بیرم لەو شتە دەکردەوە کە ژنەکە ووتبووی. ( داواکاری ) .

لەوانە نەبوو. وە ئەگەر نا بە دڵنیاییەوە هەواڵی دەدامێ.

دەستی کرد بە قسە کردن و نەمدەتوانی تەرکیز بکەم. بەبێ ئەوەی هۆی ئەم هەموو نیگەرانییە بزانم، بیرم کردەوە: ( ئەبوایە جل و بەرگی جوانترم بپۆشایە. ) لە هۆڵەکەدا منی بینی بوو و هەوڵم دەدا بیرۆکەکانی کەشف بکەم: چۆن دێمە پێش چاو ؟ چ جیاوازییەك لە نێوان کچێکی هەژدە ساڵە و ژنێکی بیست و نۆ ساڵەدا هەیە ؟

دەنگەکەی نەگۆڕا بوو هەر خۆی بوو. بەڵام دەستەواژەکانی گۆڕانکاری زۆریان بەسەردا هاتبوو.

ووتی: دەبێ لێبڕاو بیت و دڵ بە دەریا بسپێریت و نەترس بیت. تەنها کاتێك پەی بە سەیر و سەمەرەی ژیان دەبەین کە ڕێگە بدەین ئەو شتەی چاوەڕوانی ناکەین ڕوو بدات .

خوداوەند هەموو ڕۆژێك ـــ لەگەڵ هەتاودا ـــ ساتێك بە ئێمە دەبەخشێت کە دەتوانین لەو ساتەدا ئەو شتانە لەناوبەرین کە ئێمە بێزار دەکەن. هەموو

ڕۆژێك هەوڵ ئەدەين وا خۆمان دەربخەين كە لەم ساتە تێئەگەين. كە بوونى نىيە، كە ئەمڕۆ وەكو دوێنێ يە، وە وەكو سبەينێش دەبێت. بەڵام دەركەسێك ئەگەر سەرنج بداتە ڕۆژى خۆى، ئەو ساتە جادوويىە كەشف دەكات. ئەم جادووە دەتوانێت هەر لەو ساتە شاراوانەدا بێت كە ئێمواران، كە قوفڵ لە دەرگاى دەر دەدەين، لە ساتى كش و ماتى دواى زەردەپەڕ، لە هەنار و يەك شتدا كە وەكو يەك دەردەكەون. ئەم ساتە جادوويىە بوونى هەيە ـــ ساتێك كە تيايدا هەموو تواناى ئەستێرەكان بە ئێمە دەگات، وە ڕێگەمان ئەدەن سەير و سەمەرە بكەين.

خۆشبەختى هەندێك جار بەرەكەتێكە ـــ بەڵام لە ڕاستيدا ڕزگاركردنێكە (فتح). ساتى جادوويى ڕۆژێك يارمەتيمان دەدات تا گۆڕانكاريمان بەسەردا بێت، ئاگادارمان دەكاتەوە كە بەرەو خەونەكانمان هەنگاو هەڵگرين. زەجر دەكێشين، ساتێكى دژوارمان دەبێت، مەئيوس دەبين. ـــ بەڵام هەموو ئەمانە كاريگەرييەك بەجێ ناهێڵن. وە لە ئاوێنەدا، دەتوانين مەغرورانە ئيمان بە رابردوو بێنين.

بەدبەخت و داماو كەسێكە كە دەترسێت دڵ بە دەريا بسپێريت. چونكە لەوانەيە ئەو وەكو كەسێك كە خەونێكى بۆ بە دواوە چوون هەيە. لەگەڵ بێ ئوميدى و يەئس و ڕەنجدا ڕووبەڕوو نەبێتەوە. بەڵام كاتێك ئاوڕێك لە ڕابردوو دەداتەوە ـــ بۆچى كە ئێمە هەميشە ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەينەوە، ئازارى دڵى دەبيستێت. كە: (چيت كردووە لەگەڵ سەير و سەمەرەيەكدا كە خوداوەند لە هەموو ڕۆژێكى تۆدا ناشتوويەتى؟ چيت كردووە بەو بەردەوامى و لێهاتووييانەى كە پەروەردگارت بە تۆى سپاردووە؟ لە چاڵێكدا دفنت كردن، چونكە دەترساى لە دەستيان بدەيت. كەوايە ميراتى تۆ ئەمەيە: دڵنيايە كە ژيانت بەفيڕۆ داوە.)

بەدبەخت و داماو کەسێکە کە ئەم دەستەواژانە ببیستێت. چونکە لەو کاتەدا باوەڕ دێنێت بە سەیر و سەمەرەکان، بەلام ساتەکانی جادوویی ژیان بەسەرچوون.

هەر ئەوەندەی کە گفتەکانی تەواو بوون، ئامادەبووان دەوریان دا. بە چاوەڕوانی مامەوە، نیگەرانی بۆچوونێك بووم کە دوایی ئەم هەمووە ساڵە سەبارەت بە من هەی بوو. خۆمم وەکو منداڵێك دەهاتە پێش چاو ــ تا دڵنیا بووم، ئیرەیم دەبرد کە دۆستە تازەکانی ناناسم، تووڕە بووم، چونکە بیر و سەرنجی لای کەسانی تر بوو نەك من.

لە دوایدا نزیك بوویەوە. ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و ئیتر ئەو کەسە نەبوو کە ئەو قسە بە پێز و گرنگانەی دەکرد، دیسان هەر ئەو کوڕە منداڵە بوو کە لەگەڵ مندا لە پەرستگای ساو ساتوریۆ ( Sao Saturio ) خۆی حەشار دەدا و لە بارەی خەونەکانییەوە بۆ جموجوڵی جیهان دەدوا ــ وە لە هەمان ساتدا دایك و باوکمان پۆلیسیان ئاگادار کردبوەوە، چونکە وایان دەزانی لە ڕووباردا نوقم بووین.

ووتی: (سەلام، پیلار (Pilar) . )

ڕوومەتەکانیم ماچ کرد، دەمتوانی دەستخۆشی لێبکەم. دەمتوانی بەهۆی مانەوەم لە نێو ئەو کۆمەڵەدا، ماندوو ببم. دەمتوانی ڕستەیەکی خۆشەویست ئامێز سەبارەت بە منداڵیمان بڵێم، سەبارەت بە غرورێك کە بە بینینی ئەو بەم شێوەیە، هەستم بە نووقمی ستایشی خەڵکی دەکرد.

دەمتوانی ڕوونی بکەمەوە کە ناچارم دەبێ زۆر بە پەلە بڕۆم تا بگەم بە کۆتا شەمەندەفەری شەوی Zaragoza .

من دەمتوانی. هەرگیز لە واتای ئەم دەستەواژەیە تێنەگەشتم. چونکە لە تەواوی ساتەکانی ژیانماندا شتانێك هەن کە دەیانتوانی ڕوو بدەن. بەلام ڕوو

ناده‌ن. ساته‌کانی جادوویی بوونیان شتێکه که بۆ ئه‌وه‌ی پیمانی بسه‌لمێنن تێیده‌په‌ڕین، وه له ناکاو ـــ ده‌ستی چاره‌نووس ژیان ئێمه له‌ئاو ده‌بات.
وه ئه‌و ساته‌ش هه‌ر ئه‌م ڕووداوه ڕوویدا. له به‌رانی ئه‌و کارانه‌ی که ده‌متوانی به ئه‌نجامیان بگه‌یه‌نم، هاتیکم ووت که هه‌فته‌یه‌ك له‌مه‌وپێش، منی کێش کرد بۆ که‌ناری ئه‌م ڕووباره و به ئاگای هێنامه‌وه که ئه‌م ده‌سته‌واژانه بنوسم.
ته‌نها ووتم: ( ده‌توانین پێکه‌وه قاوه‌یه‌ك بخۆینه‌وه ؟ )
واو، ڕوی تێکردم و ده‌ستی چاره‌نووس گرت که به‌ره‌و ڕووی درێژ بوو.
ـــ ( ده‌ تمه‌ن ده‌بێ له‌گه‌ڵ تۆدا قسه بکه‌م. سبه‌ی له بیلباو ( Bilbao ) ووتارم هه‌یه. ئۆتۆمۆبیلم هه‌یه. )
وه‌لامم دایه‌وه: ( ده‌بێ بگه‌ڕێمه‌وه بۆ Zaragoza . ) بۆ ئه‌وه‌ی که بزانم ئه‌مه کۆتا ڕێگا بڕینی منه.
به‌لام، له که‌متر له چرکه‌یه‌ك، له‌وانه‌یه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که دووباره منداڵ بووبوومه‌وه، له‌وانه‌یه به هۆی ئه‌وه‌وه که ئێمه خۆمان باشترین ساته‌کانی ژیان هه‌ڵده‌بژێرین، ووتم:
ـــ ( پشووی جه‌ژنی ( لقاح مقدس ) مان له پێشه. ده‌توانم تا بیلباو ( Bilbao ) له‌گه‌ڵت بێم و له‌وێوه بگه‌ڕێمه‌وه. )
پرسیاره‌یه‌ك که سه‌باره‌ت به داواکارییه‌کانی بیستبووم، سه‌ر زمانی گرتبووم.
به ڕووخسارمدا هه‌ستی کرد و ووتی: ( ده‌ته‌وێ شتێك له من بپرسی ؟ )
له‌وێدا هه‌سته‌کانم بشارمه‌وه: ( به‌ڵێ. پێش کۆنفرانسه‌که، ژنێك ده‌یووت که تۆ شتێك هی ئه‌وه‌ت وه بۆی ئه‌گه‌ڕێنیته‌وه. )
ـــ ( گرنگ نییه. )

ـــ ( بۆ من گرنگە. لە ژیانی تۆ هیچ شتێك نازانم، لە بینینی ئەم هەمووە خەڵکە لێرە سەرم سوڕماوە. )

پێکەنی و ڕووی وەرگێڕا تا ئاوڕێك لە ئامادەبوان بداتەوە.

ووتی: ( تەنها ساتێك.... ) قۆڵیم گرت و ووتم: ( وەڵامی پرسیارەکەی منت نەدایەوە. )

ـــ ( شتێکی ئەو تۆ نییە کە بەلاتەوە گرنگ بێت پیلار، )

ـــ ( هەر چییەك بێت، حەز دەکەم بیزانم. )

هەناسەیەکی ساتری هەڵکێشاو بردمیە سوچێکی ئەلارەکەوە.

ـــ ( هەموو ئەدیانە یەکتاپەرستییە گەورەکانی جیهان ـــ یەهودییەت، کاسۆلیك، ئیسلام ـــ نێرینەن. ڕۆحانیەکانیان پیاون. پیاوەکان بە پێی داب و نەریتی بیرو باوەڕیان دەستەڵات و توانایان هەیە ڕێساو دەستوورەکان ڕێك بکەنەوە. )

ـــ ( مەبەستی ئەو خانمە ئەوە بوو ؟ )

ـــ ( مەبەستی ئەوە بوو کە من لە دنیادا وێنەیەکی هاوتام لە ئاخدایە. کە بڕوام بە ڕووخساری مێینەی خودا هەیە. )

وەڵامم دایەوە: ( زۆر بە باشی ڕوونت کردەوە. )

ئەو ژنەی کە چاوی لێداگرتبووم، لە دەرەوە چاوەڕوانم بوو.

ووتی: ( دەزانم هەردووکمان ئەهلی یەك بەرنامەین. من ناوم (Brida) بریدایە. )

وەڵامم دایەوە: ( نازانم مەبەستت چییە . )

پێکەنی و ووتی : ( هەڵبەتە کە دەزانی. )

پێش ئەوەی هەڵێك بۆ ڕوونکردنەوەی شتێك بڕەخسێنم، قۆڵی گرتم و بردمی لەگەڵ خۆیدا. هەوا ئەوەندە سارد نەبوو، من بە تەواوەتی نەمدەزانی تا سپێدەی ڕۆژی داهاتوو چی بکەم.

پرسیارم کرد: ( بۆ کوێ دەڕۆین ؟ )

وەڵامی دایەوە: ( تا لای پەیکەری "مریەمی مەسیح". )

ـــــ ( دەبێ بۆ ئەم شەو میوا نخانەیەکی هەرزان پەیدا بکەم. )

ـــــ ( لە دوای ئەوە پێت دەڵێم . )

هەوڵم دەدا لە کافتریایەکدا دابنیشم، کەمێك زیاتر بدوێم، هەرچییەك کە بمتوانیایە لە ئەو تێبگەم. بەڵام نەیدەویست سەبارەت بە دۆستەکەم لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا قسە بکەم، مۆڵەتم پێدا تامنی بردە شەقامی "کاستلیانا"، وە هەر لەو کاتەدا، سەیری مەدریدم دەکرد کە ساڵانێك بوو نەمبینی بوو.

لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا ڕاوەستا، ئاماژەیەکی بە ئاسمان کرد و ووتی:

ـــــ ( لێرەدایە ! )

مانگی بەدر لە نێوان چلی درەختە بێ گەڵاکاندا دەدرەوشایەوە.

ووتم: ( زۆر جوانە. )

بەڵام ئەو گوێی بە من نەدەدا. باڵەکانی بەشێوەی خاچ کردەوە، و دەستەکانی بۆ سەرەوە بەرز کردەوە و چاوی بڕییە مانگەوە.

بیرم کردەوە: ( خۆمم خستە چ دەردە سەرییەکەوە ! هاتم بۆ ئەوەی لە کۆنفرانسێکدا بەشداری بکەم کەچی کارم کەوتە دەست ئەم ژنە لە شەقامی کاستلیانا، وە سبەینێش بۆ ( Bilbao ) بیلباو دەڕۆم. )

کچەکە بە چاوی بەستراوەوە ووتی: ( ئەی ئاوێنەی دایك زەمین. توانای ئێمە بە ئێمە ببەخشە. لە ئاسمانەکاندا هەڵدێیت، دەدرەوشێیتەوە، کەم دەکەیت، و قیامەت بەرپا دەکەیت، تۆ وەرزی تۆو و میوە بە ئێمە پیشان دەدەیت. )

کچەکە دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ماوەیەکی زۆر بەم شێوازە مایەوە. کەسانێك کە تێپەڕ دەبوون، سەیریان دەکرد و پێدەکەنین، بەڵام ئەو گوێی پێنەدەدان، کەسێك کە خەریك بوو لە شەرما دەمرد، من بووم کە لە پەنایدا ڕاوەستا بووم.

دوای ماوەیەکی زۆر لە ستایش کردنی مانگ ووتی: ( ئەبوایە ئەم کارەم بکردایە تا "مریەمی مەسیح" پارێزگاریمان لێ بکات. )

ــــ ( سەرەنجام دەڵێی سەبارەت بە کێ قسە دەکەی ؟ )

ــــ ( سەبارەت بەو شتەی کە دۆستەکەت لە بارەیەوە دەدوا، بەڵام بە شێوەیەکی بیرسا "واقعی". )

لەناکاو تێگەیشتم کە گوێم بۆ ووتارەکە نەگرتووە. بە تەواوەتی نەمدەزانی کە دۆستەکەم سەبارەت بە چی قسەی کردووە.

کاتێ دووبارە کەوتینە ڕێ، کچە لاوەکە ووتی: ( ئێمە ڕووخساری مێینەی خوداوەند دەناسین. ئێمەی ژنان، لە نیشتمانی دایك تێدەگەین و خۆشمان دەوێت. عەقڵ و هۆشی خۆمان لە ناو ئەشکەنجەکان و ئاگردا بە دەست هێناوە، بەڵام بە زیندوویی ماینەوە. وەك ئەوەی لە نهێنییەکانی تێبگەین. )

ئاگرەکان. جادوگەرەکان.

بە ووردی سەرنجی ژنێکم دەدا کە لە پەنامدا بوو، زۆر جوان بوو زوڵفەکانی تا کەمەری شۆڕ بووبوویەوە.

ــــ ( کاتێك پیاوەکان دەچوون بۆ ڕاو، ئێمە لە ئەشکەوتەکاندا، لە ڕەحمی دایکدا دەماینەوە و پارێزگاریمان لە منداڵەکان دەکرد. وە لێرەدا بوو کە نیشتمانی دایك هەموو شتێکی فێر کردین.

پیاوەکان لە جووڵەدا بوون، بەڵام ئێمە لە ڕەحمی دایکدا دەماینەوە. وە بەم شێوەیە بوو کە تێگەشتم تۆو دەگۆڕرێت بۆ گیا ، وە ئەمەمان بە مێردەکا نمان

ووت. ئێمە یەکەم نانمان دروست کرد و دەرخواردی پیاوەکانمان دا. ئێمە یەکەم جامی قوڕینمان بۆ خواردنەوەی پیاوەکان دروست کرد. وە لە دروستکردنی گەردون تێگەشتین.چونکە جەستەی ئێمە لاسایی ڕێ و ڕەسمی مانگی دەکردەوە.)

لە ناکاودا ڕاوەستا:

ـــ (لێرەدایە.)

سەرنجم دەدا. لە ناوەڕاستی مەیدانێکدا کە پڕ بوو لە کەرەستەی گواستنەوە، فوارەیەکی ئاو هەبوو. لە ناوەڕاستی ئەم فوارەیەدا، پەیکەری ژنێك هەبوو کە شێرەکان ڕایاندەکێشا.

ویستم شارەزایی خۆم لە مەدریددا پیشان بدەم و ووتم: (ئەمە مەیدانی "Cibele"سیبلە.)

پێش تر، ئەم پەیکەرەم لەسەر دەیان کارتی بانگهێشت بینی بوو.

بەڵام ئەو گوێی بە من نەئەدا. لە ناوەڕاستی شەقامدا بوو هەوڵی دەدا خۆی لە ناو ئوتۆمۆبیلەکان ڕزگار بکات. لە نێوان ئوتۆمۆبیلەکاندا دەستێکی بۆ ڕاوەشاندم و هاواری کرد:

ـــ (وەرە بڕۆین بۆ ئێرە!)

تەنها بۆ پرسیار کردنی ناوی میوانخانەیەك، بڕیارمدا بە دوایدا بڕۆم. ئەو دێوانەیە خەریك بوو ماندووی دەکردم و زۆر پێویستم بە خەو بوو.

هاوکات گەشتینە فوارەکە، من بە دڵ لێدانەوە و ئەویش بە پێکەنینەوە.

ووتی: (ئاو! ئاو دەرخستەی ئەوە!)

ـــ (تکات لێ دەکەم ناوی میوانخانەیەکی هەرزان بە من بڵێ.)

دەستی بردە ناو فوارەکەوە.

ووتی: (تۆش هەر ئەم کارە بکە. دەست بدە لە ئاوەکە.)

ـــــ ( هەرگیز نابێت. بەڵام نامەوێ ناڕەحەتت بکەم. دەبێ میوا نخانەیەکی هەرزان پەیدا بکەم. )

ـــ ( تەنها یەك خولەکی تر درێژە دەکێشێ. )

کچە لاوەکە فلوتێکی بچووکی لە جانتاکەی هێنایە دەرەوە و دەستی بە فلوت لێدان کرد.

دەنگی فلوتەکە وەك ئەوەی کاریگەری مادەی سڕکەری هەبێ: دەنگە دەنگی ترافیکەکان دوور کەوتەوە و دڵم ئارامی گرت. لەسەر لێواری حەوزەکە دانیشتم، گوێم بۆ زمزمەی ئاو و فلوتەکە ڕادێرا و چاوم بڕییووە مانگی بەدر کە لە سەرووومانەوە دەدرەوشایەوە. شتێك بە منی دەووت ـــــ هەرچەندە نەمدەتوانی بە باشی تێبگەم ـــــ کە بەشێك لە سرووشتی ژنانەی من لێرەدایە.

نازانم چەندێك فلوتی لێدا. کاتێ لە فلوت لێدان بوویەوە، ڕووی وەرگێڕا بەرەو فوارەکە.

پرسیارم کرد: ( تۆ کێیت؟ بۆچی داوات لە من کرد لەگەڵت بێم ؟ )

ڕووی لە من کرد:

ـــ ( هەمان ئەو کەسەم کە وا دەزانی. من بەشێك لە ئاینی سەر زەوی ڕێك دەخەم. )

تکام لێکرد: ( چیت لە من دەوێ ؟ )

ـــــ ( دەتوانم چاوانت بخوێنمەوە. دەتوانم دڵت بخوێنمەوە. تۆ عاشق دەبی. وە ڕەنجیش دەکێشی. )

ـــــ ( من ؟ )

ـــــ ( دەزانی سەبارەت بە چی دەدوێم. من بینیم کە ئەو چۆن چۆنی سەیری دەکردی. ئەویینداری تۆیە. )

ئەو ژنە دێوانە بوو.

درێژەی پێدا : ( هەر لەبەر ئەوە داوام لێکردی کە لەگەڵم بێیت. چونکە ئەو گرنگە. هەرچەندە قسەی پوچ و بێ واتا دەکات، بەلام بەلانی کەمەوە نیشتمانی دایك دەناسێت. مەهێڵە ڕێگا وونکات. یارمەتی بدە. )

ووتم : ( نازانم دەڵێی چی. لە خەیاڵاتی خۆتدا وون بوویی. ) وە ڕووم وەرگێڕا و ڕوو بە ئوتۆمۆبیلەکان گەڕامەوە، وە هەر لەم کاتەدا سوێندم خوارد ئیتر هەرگیز بیر لە ووتەکانی ئەو ژنە نەکەمەوە.

## يەك شەممە

## 1993/12/5

بۆ قاوە خواردن ڕاوەستاين.

بۆ ئەوەى سەرى قسە دا بمەزرێنم، ووتم: (ژيان زۆر شتى فێرى تۆ كردووە.)

وەلامى دايەوە: (منى فێركرد كە دەتوانين فێر ببين، فێربووم كە دەتوانين بگۆڕێين، هەتا ئەگەر جێگەى باوەڕيش نەبێت.)

وويستى كۆتايى بە قسەكان بێنێت. نزيكەى دوو كاتژمێر لە نێو ڕێگادا تا گەشتينە ئەو بارە هيچ قسەمان نەكردبوو.

سەرەتا هەوڵمدا ئاماژە بە ياداوەرييەكانى دەورانى منداڵيمان بكەم، بەلام ئەو تەنها جەختى لەسەر ئەدەب دەكردەوە. هيچ گوێى بۆ قسەكانم ڕانەدەدێرا و سەبارەت بە شتانێك پرسيارى دەكرد كە پێشتر پێم ووتبوو.

لە لايەكەوە كارەكە هەڵە بوو. بريا زەمان و مەكان بۆ هەميشە ئەوى لە دنياى مندا دوور بخستايەتەوە. بيرم كردەوە: ( سەبارەت بە ساتە جادووييەكان بدوێين. چ بايەخێكى بۆ ئەو هەيە كە "Carmem,Maria,Santiago" كارميم، ماريا يا سانتياگۆ چى دەكەن ؟)

دنياى ئەو جياواز بوو، سوريا تەنها يادگارييەكى دوور دەست بوو، شارێك كە لە زەماندا وەستا بوو، دۆستانى دەورانى منداڵى ئەو هێشتاش منداڵ بوون، وە گەورەكان هێشتا زيندوو بوون و هەر ئەو كارانەيان دەكرد كە بيست و نۆ ساڵ لەمەو پێش دەيانكرد.

كەم كەم پەشيمان دەبووم لەوەى كە لەگەڵيدا هاتووم. لەكاتى خواردنەوەى قاوەدا، كاتێ دووبارە بابەتى ووتووێژەكەى گۆڕى، بڕيارمدا ئيتر داواى لێ نەكەم.

دوو كاتژمێرى مابوو تا بيلباو، وەك ئەشكە نجە و ئازاردانێكى واقعى بوو. ئەو لە شەقامەكانى دەڕوانى، من لە پە نجەرەوە سەيرى دەرەوەم دەكرد، وە هيچ يەكێك لە ئێمە ئەو هەستە خراپەى حەشار نەدەدا كە دادوەرى دەكردين. ئوتۆمۆبيلە كرێيەكەى ڕاديۆى تێدا نەبوو، تەنها چارەمان تەحەمول كردنى بێدەنگى بوو.

هەر ئەوەندەى كە لە ڕێگەى ئازاد دەرچووين، ووتم: ( بپرسم شوێنى وەستانى پاس لەكوێيە. لێرەدا خەتى پاس بۆ Saragoza هەيە. )

كات دواى نيوەڕۆ بوو و كەسانێكى كەم لەسەر شەقام بوون. لە تەنيشت پياو ژنێكى لاوەوە تێپەڕين، بەلام ئەو ئوتۆمۆبيلەكەى ڕانەگرت.

دواى ماوەيەك پرسيم: ( دەزانى لە كوێيە ؟ )

ــــ ( چى لە كوێيە ؟ )

ديسانەوە گوێى بۆ قسەكانم نەدەگرت. تا لەناكاو لە واتاى بێدەنگييەكەى گەشتم. چى هەبوو كە بە ژنێك بلێت كە هەرگيز دنياى نەدييوو؟ چ چاكە و ميهرەبانييەكى هەبوو لە پەناى كەسێكدا كە لە نەناسراوەكان دەترسا، كە كارێكى دلنيا و زەواجى يەكترناسينى پێشبينى دەكرد ؟ من ــــ بێچارە من ــــ باسم لە هەمان دۆستانى مندالى دەكرد، لە يادەوەرييە تۆز گرتووەكانى لادێيەكى بێ بايەخ. ئەمە تەنها بابەتێك بوو كە بۆ گفتوگۆ كردن هەمبوو.

دواى گەشتن بە شوێنێك كە چەقى شار دەركەوت، ووتم: ( دەتوانى هەر لێرەدا دامبەزێنى. ) هەولم دەدا وەك كەسێكى ئاسايى ڕەفتار بكەم، بەلام هەستم دەكرد گێل و مندالم و دل گيراوم.

ئوتۆمۆبيلەكەى ڕانەگرت.

داوام لێكرد: ( دەبێ پاسى گەڕانەوە بۆ Saragoza پەيدا بكەم. )

ـــــ ( هەرگيز لێرە نەبووم. نازانم ميوا نخانەکەم لە کوێيە. نازانم کۆنفرانسەکەم لە کوێيە. نازانم شوێنی وەستانی پاس لە کوێيە. )

ـــــ ( خۆم پەيدای دەکەم، نيگەران مەبە. )

ووتی: ( حەز دەکەم....... )

وە دوايی هەوڵی دا قسەکەی تەواو بکات، بەڵام نەيتوانی. دەمزانی دەيەوێت: سوپاسم بکات لەوەی کە هاوکۆچی بووم، سەلام بگەيەنێتە دۆستە کۆنەکانی، و ـــــ بەم شێوازە ـــــ هەستە ناخۆشەکانی لەناو بەرێت.

ـــــ ( حەز دەکەم ئەم شەو لەگەڵم بێيت بۆ کۆنفراس. )

سەرسام بووم. لەوانەيە هەوڵی دەدا کات بە فيرۆ بدات تا بێدەنگی کۆچەکەمان قەرەبوو بکاتەوە.

دووبارەی کردەوە: ( زۆر حەز دەکەم لەگەڵم بێيت. )

لەوانەيە کچێکی لادێيی بم، بەبێ بەسەرهاتێکی شايستە بۆ باس کردن، بەبێ درەوشانەوەو سەرنج ڕاکێشانی ژنانی شاری. بەڵام ژيانی لادێيی، هەرچەندە ناهێڵێت ژنێك جل و بەرگی جوان بپۆشێت و ئامادە بێت، بەڵام فێری دەکات چۆن گوێ بۆ دڵی بگرێت ـــــ وە لە غەريزەی خۆی تێبگات.

بەو پەڕی سەرسامييەوە، غەريزەم دەيووت کە ئەو ڕاستگۆيە.

هەناسەيەکی ڕاحەتم هەڵکێشا. هەڵبەتە بۆ هيچ کۆنفرانسێ نەدەمامەوە، بەڵام هيچ نەبێ وەك ئەوەی دۆستە ئازيزەکەی جارانم گەڕابێتەوە، منی ڕوو بە ڕووداوەکانی خۆی ڕا پێچ دەکرد، دەيوويست لە ترس و سەرکەوتووييەکانيدا شەريکم بکات.

وەڵامم دايەوە: ( سوپاسی بانگهێشتەکەت دەکەم. بەڵام پارەی ميوا نخانەم نييە، وە دەبێ بگەڕێمەوە و دەرسەکانم بخوێنم. )

ـــ ( من كەمى پارەم هەيە. دەتوانى لە ژوورەكەى من بمێنيتەوە. دوو شوێن خەوى تۆكمە دەگرين. )

سەرنجم دا بە بوونى سەرماش، ئارەقى كردووە. دڵم دەستى كرد بە ناردنى ئاگاداريانێك كە لە واتاكەيان نەدەگەشتم. هەستى شادى چەند ساتێك لەمەوپێش شوێنى بەسەرهاتێكى گەورەى گرتبوو.

لە ناكاو ئوتۆمۆبێلەكەى ڕاوەستاند و لە چاوانمى ڕوانى.

هيچ كەس نەيدەتوانى درۆ بكات، هيچ كەس ناتوانێت كاتێ بە ڕێكى لە چاوانمان بڕوانێت، شتێك حەشار بدات.

وە هەر ژنێك، بە كەمترين هەست، دەتوانێت چاوانى پياوێكى عاشق بخوێنێتەوە. هەرچەندێكيش بە سەرسام بوون خۆى بنوێنێت، هەر چەندێكيش دەرخستەى ئەم پەشێويە، لەم كات و شوێنەدا ناجۆر بێت. بە خێرايى كەوتمە يادى ووتەكانى ئەو ئافرەتە موو سوورە لە كەنارى فوارەكەدا.

جێگەى باوەڕ نەبوو. بەلام ڕاست بوو.

هەرگيز، هەرگيز بيرم نەكردبۆوە كە ـــ ماوەيەكى زۆر لەمەوپێش ـــ هێشتا لە بيريدا بێت. منداڵ بووين، پێكەوە دەژياين و دەست لە ناو دەستى يەك، جيهانمان كەشف دەكرد. خۆشم دەويست ـــ ئەگەر منداڵێك بتوانێت لە واتاى ڕاستى ئەوين بگات. بەلام ساڵانێكى لەمەوپێش بوو ـــ لە ژيانێكى تردا، شوێنێك كە بەرائەت، دڵ بە ڕووى هەر شتێكى جوان لە ژياندا دەكاتەوە.

وەك ئەوەى كە گەورە بووبووين و بەرپرسياريمان لە ئەستۆ هەبوو. مەسەلەكانى منداڵى هى دەورانى منداڵى بوون.

لە چاوانيم ڕوانى. نەمدەوويست يا نەمدەتوانى باوەڕ بكەم.

درێژەی پێدا: ( تەنها هەر ئەم کۆنفرانسە ماوە، دوای دەڕۆین بۆ جەژنی "لقاح مقدس". دەبێ بڕۆین بۆ کێوەکان. دەمەوێ شتێکت پیشان بدەم. )
ئەو پیاوە شکۆمەندە کە سەبارەت بە ساتە جادووییەکان دەدوا، لەوێدا لە بەردەمی مندا بوو بە هەڵەترین ڕەوش ڕەفتاری دەکرد. زۆر توند دەڕۆشت، لە خۆی دڵنیا نەبوو، پێشنیاری تێکەڵ و پێکەڵی دەکرد. بینینی ئەو بەم شێوازە ئازار بەخش بوو.
دەرگاکەم کردەوە، دابەزیم و پاڵم بە ئوتۆمۆبیلەکەوە دا. جگەرەیەکم داگیرساند و هەوڵمدا بیر نەکەمەوە. نەمدەتوانی خۆم لەم ڕێگەیە بدەم، خۆم وا پیشان بدەم کە لە مەبەستی ناگەم ـــ نەمدەتوانی خۆم ڕازی بکەم کە ئەمە بەڕاستی پێشنیاری دۆستێکە، بۆ دۆستی دەورانی منداڵی خۆی. لەوانەیە کۆچی زۆری کردبوو، وە خەریك بوو بابەتەکانی تێکەڵ و پێکەڵ دەکرد.
لە ئوتۆمۆبیلەکە دابەزی و لە پەنامەوە دانیشت.
دووبارە ووتی: ( حەز دەکەم ئەم شەو بۆ کۆنفرانسەکە بمێنیتەوە. بەڵام ئەگەر ناتوانی، دەرکت پێدەکەم. )
ئەها ! دنیا جارێکی تر سوڕایەوە و هاتەوە شوێنی خۆی. هیچ ئەو شتانە نەبوو کە بیرم دەکردەوە. ئیتر زۆری نەدەکرد کە بمێنمەوە، ئیتر ئامادە بوو مۆڵەتی ڕۆشتنم بداتێ. پیاوانی ئەویندار بەم شێوەیە ڕەفتار ناکەن.
هاوکات هەستم بە ئارامی کرد. بەڵێ، دەمتوانی بمێنمەوە، بەلایەنی کەمەوە ڕۆژێکی تر. پێکەوە نانی ئێوارەمان دەخوارد، کەمێك مەست بو بووین..... کارێك کە لە منداڵیدا نەمانکردبوو. هەلێکی باش بوو بۆ لەبیرکردنی ووتە بێ واتاکان و باڵندەکان کە چەند خولەکێك لەمەوبەر بیرم دەکردەوە، هەلێکی باش بۆ شکاندنی سەهۆڵبەندانێك کە لە مەرید لەگەڵما بوو.

تەنها ڕۆژێك فەرقی نەدەكرد، قسە گەلێكم هەبوو كە بە دۆستەكانمی بڵێم.
بە شێوازێكی نەكتەرانە ووتم: ( دوو شوێن خەوی جیا، وە پارەكەش تۆ دەیدەیت، چونكە هێشتا خوێندكارم و پارەم نییە. )
جانتاكانمان لە ژوورێكی میوانخانەكەدا دانا و هاتینە خوارەوە تا بە ئەسپایی ڕەو شوێنی كۆنفرانسەكە بڕۆین. زۆر زوو گەشتین و لە كافتریایەكدا دانیشتین.
كیفێكی سووری بچووكی بە من دا و ووتی: ( دەمەوێت شتێك بە تۆ ببەخشم. )
هەر لەوێدا كردمەوە. مەدالیایەكی دێرین و ژەنگ لێدراو، كە حەزرەتی مەریەم لەسەر ڕوویەكی و قلبی موقەدەسی عیسا لە ڕووەكەی تری بوو.
كاتێ سەرسامی منی بینی، ووتی: ( هی خۆتە . )
دڵم دووبارە دەستی كرد بە ئاگاداری ناردن.
ـــــ ( ڕۆژێكی پایزی وەكو ئێستا، دە ساڵان بووین. لە مەیدان، لە ژێر درەختێكی بەڕودا دانیشتبووین.
دەمویست شتێك كە چەند هەفتەیەك لەمەوپێش لە بیریدا بووم، بە تۆی بڵێم. بەڵام هەر ئەوەندەی كە دەستم پێكرد، ووتت كە مەدالیاكەت لە پەرستگای سانتوریو وون كردووە و داوات لە من كرد كە بە دوایدا بگەڕێم. )
لە بیرم بوو. ئاخ، خودایە، لە بیرم بوو.
درێژەی پێدا: ( توانیم بیدۆزمەوە، بەڵام كاتێ گەڕامەوە بۆ مەیدان، ئیتر نەمدەوێرا شتێك كە بیرم لێدەكردەوە، بە تۆی بڵێم. دوایی بەڵێنم بە خۆم دا كە تەنها كاتێ مەدالیاكەت بۆ بگەڕێنمەوە كە ڕستەیەك تەواو بكەم، كە ئەو كاتە دەستم بە ووتنی كردوو، ماوەیەكی زۆر هەوڵم دا لە بیری بكەم، بەڵام ئەو ڕستەی هەمیشە ئامادە بوو. ئیتر ناتوانم لەگەڵیدا بژیم. )

پیاڵە قاوەکەی لەسەر مێزەکە دانا و جگەرەیەکی داگیرساند و ماوەیەکی زۆر چاوی بڕییە سەقفەکە و سەرسام بوو: لە دوایدا ڕووی تێکردم و ووتی:

ـــــ ( ڕستەیەکی زۆر سادە و ساکارە....

خۆشم دەویّ. )

ووتی: هەندێ جار خەمۆکیەکی درێژخایەن دامدەگرێت کە ناتوانم دەستبەرداری بم. تێدەگەین کە ساتی جادوویی ئەو ڕۆژە بەسەر چووە، وە هیچمان نەکردووە. دوا بەدوای ئەوە ژیان جادو و هونەرەکەی دەشارێتەوە.

دەبێ گوێ ڕادێرین بۆ ئاوازی منداڵی کە ڕۆژگارێك منداڵ بووین، منداڵی کە هێشتا لە ناخی ئێمەدایە. ئەم منداڵە لە ساتە جادوویەکان تێدەگات.

دەتوانین هاواری زیندە بەچاڵ بکەین، بەلام ناتوانین ئاوازەکانی بخەوێنین.

منداڵی کە ڕۆژێك منداڵ بووین، ئێستاش ئامادەیە. شاد و سەرکەوتوو بن منداڵان، چونکە فریشتەکانی ئاسمان لەوانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

ئەگەر دووبارە لەدایك نەبین، ئەگەر جارێکی تر لەگەڵ بەرائەتی و پاکی منداڵیدا نەگەڕێینەوە بۆ ژیان، ئیتر واتایەك بۆ ژیان نامێنێتەوە.

ڕەوشێکی زۆر بۆ خۆ کوژی هەیە. کەسانێك کە هەوڵ دەدەن جەستەیان بکوژن، یاساکانی خوداوەند دەخەنە ژێر پێیان. ئەوانەی کە هەوڵ دەدەن ڕۆحی خۆیان نابوت بکەن ئەوانەش یاساکانی خوداوەند دەخەنە ژێر پێیان، هەرچەند تاوانەکانیان لە دیدگای خەڵکانەوە کەمتر ئاشکرایە.

گوێ ڕادێرین بۆ ئەو منداڵەی ( دڵ ) کە لە سینەماندا دەڵێت. شەرمەزار نەبین لەوەی کە گوێی بۆ ڕادەدێرین، نەهێڵین بترسێت، کە تەنهایە و لەوانەیە هەرگیز دەنگی نەبیسترێت.

مۆڵەت بدەینم کە ئەو کەمێك هەستمان بگرێتە دەست. ئەم منداڵە دەزانێت کە هەر ڕۆژێك جیاوازە لەگەڵ ڕۆژێکی تردا.

کارێك بکەین کە جارێکی تر هەست بە بوونی خۆشەویست بکات. ئـەم منداڵـە ڕازی بکەین ـــــ هەتا ئەگەر پابەند بێت بـە ڕەفتـاری ناشایـستە و بێـزار کەرەوە ، هەتا ئەگەر لە چاوی خەڵکانەوە بێ ئەقڵانە خۆی بنوێنێت.

فەرامۆشی نەکەیت کە زانایی ئیلسانەکان لە بەرامبەر خوداوەنددا ئەزانینـە.

ئەگەر گوێ ڕادێرین بۆ منداڵی کە لە ڕۆحی خۆماندا هەیە، ئەوا چـاوەکانمان دەدرەوشێنەوە. ئەگەر پەیوەندیـەکانمان لەگـەڵ ئـەم منداڵـەدا لـە دەسـت نەدەین، ئەوا پەیوەندی لەگەڵ ژیاندا لە دەست نادەین.

هەستم دەکرد بە تونـد تـر قـسەم دەکـرد، وە کاتێـك پەرداخەکـە دووبـارە دەخەمەوە سەر مێزەکە، دەنگە دەنگێکی زیاتر بەرپا دەکەم.

لەگەڵ کۆمەڵێکی دە نەفەری، ڕاسـتەوخۆ لـە شـوێنی کۆنفرانـسەوە بـۆ نـان خواردنی ئێوارە هاتبووین، وە من پێدەکەنیم ـــ پێدەکەنیم، چونکە شەوێکی جیاواز بوو. دوای سـاڵانێك، یەکـەمین شـەو بـوو کـە بـەبێ بەرنامـە ڕێـژی تێدەپەڕی.

چەندە شەوێکی خۆش بوو خواردنەکە چەندە دەچەسپا !

کاتێ بڕیارمدا بگەڕێمـەوە بـۆ مەدریـد، هەسـت و کردارەکـانم خـستە ژێـر چاودێرییەوە. لە ناکاو هەموو شتێك گۆڕرا بوو. لەوێدا بووین ـــ لە شارێکدا کە سێ کاتژمێر ڕێگا لە شوێنی لە دایك بوونمەوە دوور بوو. لە پیشتی مێز کە کەسانێکی زۆر لە دەوری دانیشتبوون، تـەنها یـەك نەفـەرم دەناسـی ـــــ وە هەمووان بە شێوازێك قسەیان لەگەڵ دەکردم کە ئەتووت ساڵانێکە دەمناسـن.

سەرم لە خۆم سوڕ دەما کە دەمتوانی قسە بکەم، بخۆمەوە و لەگەڵ ئەوانەدا بە خۆشی کات بە ڕێ بکەم.

لەوێدا بووم، چونکە ـــ لە ناکاو ـــــ ژیـان منـی گەڕانـدبوەوە بـۆ ژیـان. هەستم بە تـاوان، یا تـرس، یا شەرم نەدەکرد. کاتێ کە لە پەنای ئەودا بـووم

ـــ وە دەنگیم دەبیست ـــ زیاتر باوەڕم دەکرد کـە حـەق لای ئـەوە: هێـشتا ساتـانێك هەیە کە دەبێ لەو ساتـانەدا دڵ بە دەریـا بـسپێرین، وە هـەنگاوی مەجنون ئاسا هەڵگرین.

بیرم کردەوە: ( ڕۆژانە لە بەردەم کتێب و دەفتـەردا دادەنیـشم، هـەوڵێکی لـە سەرو توانای مرۆڤەوە بۆ دروستکردنی زنجیرەکـانی خـۆم ئەیـەم. ئـەم کـارە دەوڵەتیەم بۆ چی دەوێت ؟ بە ناونیشانی ژنێك، چ شتێك بۆ من زیاد دەکات ؟ ) هیچ. نەهاتبوومە دنیاوە تـا باقی ڕۆژەکانی ژیانم لە پشتی مێـزەوە بەسـەر بەرم و وەك و دادوەرێك بە خێرایی لێخۆش بوون یارمەتی مەسەلەکانی دادگـا بدەم.

ـــ ( ناتوانم بەم شێوەیە سەبارەت بە ژیانم بیر بکەمەوە. هەر ئەم هەفتەیە دەمەوێ دووبـارە بڕۆمەوە بە دوایدا. )

حە تمەن کاریگەری شەراب بوو. هەرچی بوو، هەر کەسێك کار نەکات ؟ ناخوات ؟

ـــ ( ئەمە تەنها خەونێکە . تێدە پەڕێت . )

بەلام ئەم خەونە چەندە درێژە دەکێشێت ؟ بۆ یەکەم جار بیرم کردەوە ڕۆژەکانی تر لە کێوەکاندا لەگەڵ ئەودا بەسەر بەرم.

ژنێکی جوان لە سەر مێزەکەی ئێمەدا پرسی: ( تۆ کێیت ؟ )

وەلامم دایەوە: ( دۆستێکی دەورانی منداڵی . )

درێژەی پێدا: ( لە دەورانی منداڵیشدا لەم کارانەی دەکرد ؟ )

ـــ ( کام کارانە ؟ )

لە ناکاودا هەمووان لەسەر مێزەکە بێدەنگ بوون.

ژنەکە ووتی: ( خۆت دەزانی. سەیر و سەمەرە. )

بێ ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ مه‌به‌ستی ژنه‌كه‌ بگه‌م، وه‌ڵامم دایه‌وه‌: ( ئه‌و كاتانه‌ش باش قسه‌ی ده‌كرد. )

هه‌موان پێكه‌نین، هه‌تا ئه‌ویش ـــــ وه‌ ئه‌مده‌زانی هۆی ئه‌م پێكه‌نینه‌ چییه‌. به‌لام مه‌ستیه‌كه‌م نه‌مابوو.

بێده‌نگ بووم، سه‌یرێكی ده‌ور و به‌رم كرد، شتێك كه‌ سه‌باره‌ت به‌و بابه‌ته‌ ووتم به‌ زوویی له‌ بیرم كرد. وه‌ سه‌باره‌ت به‌ جه‌ژنه‌كه‌مان بیرم كرده‌وه‌.

لێره‌ بوون و ئاشنا بوون به‌ كه‌سانێكی تازه‌ باش بوو. قسه‌ سویمه‌ته‌كان و جدییه‌كانیان تێكه‌ڵ ده‌كرد، هه‌ستم ده‌كرد ئه‌وه‌ی له‌ جیهاندا ڕوو ده‌دات به‌شێكم لێی. هیچ نه‌بێ ئه‌م شه‌و ژنێك بووم كه‌ له‌ ڕێگه‌ی ته‌له‌فزیۆن یان ڕۆژنامه‌كانه‌وه‌ له‌ ژیاندا ئاماده‌ بووم.

دوای گه‌ڕانه‌وه‌م بۆ Zaragoza قسانێكی زۆرم بۆ ووتن هه‌بوو. ئه‌گه‌ر ڕازی ده‌بووم به‌ بانگهێشته‌كه‌ی بۆ جه‌ژنی ( لقاح مقدس )، ده‌متوانی ساڵێكی ته‌واو له‌گه‌ڵ یاداوه‌رییه‌ تازه‌كاندا به‌سه‌ر به‌رم.

بیرم كرده‌وه‌: ( به‌ته‌واوی مافی خۆی بوو كه‌ گوێ به‌ قسه‌كانی من نه‌دات سه‌باره‌ت به‌ سوریا. ) وه‌ دڵم بۆ خۆم ده‌سووتا: ساڵانێك بوو هه‌ر هه‌مان ئه‌و داستانه‌ كۆنانه‌م له‌ زاكیره‌مدا پاراست بوو.

پیاوێك به‌ سه‌ر و ڕیشی سپییه‌وه‌، پێكه‌كه‌ی پڕ كردم و ووتی: ( كه‌مێك زیاتر بنۆشه‌. )

نۆشیم. بیرم له‌ هه‌ندێ شت ده‌كرده‌وه‌ كه‌ بۆ ووتن هه‌مبوو بۆ منداڵه‌كان و ئه‌وه‌كانم.

ئه‌و، به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ هه‌میشه‌ ببیستێت، ووتی: ( له‌سه‌رت حساب ده‌كه‌م. ده‌ڕۆین بۆ فه‌ره‌نسا. )

مه‌ستیم ئه‌ما تا شتانێك كه‌ بیرم لێده‌كردنه‌وه‌، بیان هێنمه‌ سه‌ر زمان.

ـــ ( تەنها بە مەرجىَ ئەوەى كە تەنها يەك شتم بە باشى بۆ ڕوون بكەيتەوە. )

ـــ ( چى ؟ )

ـــ ( شتێك كە پێش لە كۆنفرانسەكە ووتت. لە كافترياكەدا. )

ـــ ( مەداليا؟ )

لە چاوانيم ڕوانى و تەواوى توانام خستە گەڕ تا بە هۆشيارى بێمە بەرچاو:

ـــ ( شتێك كە ووتت. )

ووتى: ( دوايى لەگەڵ يەكدا قسە دەكەين. ) بابەتەكەى گۆڕى.

بوارێكمان بۆ قسە كردن نەبوو، بەلاَم توانيم ڕازى بكەم بەوەى كە شتێكى لەو شێوەيە نىيە.

ووتم: ( ئەگەر دەتەوێت لەگەڵت بێم. دەبىَ گوىَ بۆ گفتەكانم ڕادێرى. )

ـــ ( نامەوىَ لێرە قسە بكەين. خەريكين بە خۆشى كات بەڕىَ دەكەين. )

تكام ليكرد: ( تۆ زۆر زوو لە سوريا ڕۆشتى. من تەنها پەيوەنديم بە سەر زەوى دايكيتەوە هەيە. مۆڵەت دەدەم نزيك تر بيتەوە لە ڕەگ و ڕيشەكانت، وە ئەمەش توانايەكى زياترت بۆ پێشڕەوى پێدەبەخشىَ.

بەلاَم تەنها ئەمەيە. لەوانە نىيە ئەوينێك لە بەرنامەدا بێت. )

بەبىَ ئەوەى شتێك بڵێت، قسەكانمى بيست. كەسێك بانگى كرد تا بپرسێت مەبەستى چىيە، وە نەمتوانى درێژە بە گفتەكانم بدەم.

بە خۆمم ووت: ( هيچ نەبىَ توانيم فكرى خۆم بڵێم. ) ئەوينێكى بەم شێوەيە، تەنها دەيتوانى لە چيرۆكى پەرييەكاندا بوونى هەبێت.

بۆچى كە لە ژيانى ڕاستيدا، ئەوين دەبێت لەوانە "ممكن" بێت. هەتا ئەگەر ئەوينبازيش وەلاَمى ئەمەى نەبىَ، تەنها لە كاتێكدا دەتوانێت زيندوو بمێنێت كە ئومێدێك بۆ ڕزگارى ئەويندارێك بوونى هەبێت.

باڵنیەکەی خەون و خەیاڵە.

وەك ئەوەی بیرۆکەکەمی خوێندبێتەوە. لەو سەری مێزەکەوە پێکەکەی بەرز کردەوە:

— ( بە سەلامەتی ئەوین ! )

ئەویش کەمێك مەست بوو بوو. بڕیارمدا سوود لە هەل وەربگرم.

— ( بە سەلامەتی خاوەن بیرو هۆشان، کە دەزانن هەندێ لە ئەویندارەکان، هەڵچوونێکی منداڵانەن. )

وەڵامی دایەوە: ( کەسێك کە خاوەن بیرو هۆشە ، تەنها لەبەر ئەوە خاوەن بیرو هۆشە کە هۆگری ئەوینە. وە کەسێك کە گێل و گەوجە، تەنها لەبەر ئەوە گێل و گەوجە کە وا دەزانێت دەتوانێت لە ئەوین تێبگات. )

ئامادەبوانی سەر مێز، ڕستەکەیان بیست و لە کەمتر لە خولەکێك، باسێکی پڕ شەپۆل سەبارەت بە ئەوین دەستی پێکرد. هەر کەسە و بۆچوونێکی تایبەتی هەبوو وە بە چنگ و ددان لە دیدگای خۆی پارێزگاری دەکرد، وە بتلێکی زۆری شەراب بۆ ئارام کردنەوەیان پێویست بوو. سەرەنجام کەسێك ووتی کە ئیتر درەنگی کردووە، وە خاوەنی ڕستورانەکە دەیەوێت دەرگا ببەستێ.

کەسێك لە پشت مێزێکی ترەوە هاواری کرد: ( پێنج ڕۆژ پشوومان هەیە. ئەگەر خاوەنی ڕستوران دەیەوێت دایبخات، بۆ ئەوەیە کە ئێوە سەبارەت بە مەسایلی جدی قسە دەکەن ! )

هەموو پێکەنین، مەگەر ئەو.

لە پیاوێکی مەستی پشت مێزی پرسی: ( دەبێ لە کوێ سەبارەت بە مەسایلی جدی بدوێین؟ )

مەستەکە ووتی: ( لە کەنیسە ! ) وە ئەم جارەیان، تەواوی دانیشتوانی ناو ڕستورانەکە دایان لە قاقای پێکەنین.

ئەو لە شوێنی خۆی هەستایەوە. وامزانی دەیەوێت شەڕ بکات، چونکە گەڕابووینەوە بۆ دەورانی لاوێتی، گەڕابووینەوە بۆ دەورانێك کە شەڕ کردن بەشێك بوو لە شەو.... دەورانی شەڕ و خەیر لە شوێنی قەدەغە کراودا، دەورانی مۆسیقای توند و خێرا.

بەڵام تەنها کارێك کە کردی، ئەوە بوو کە دەستی منی گرت و ڕوو بە دەرەوە بردمی.

ووتی: ( باشتر وایە هەموومان بڕۆین. درەنگی کردووە. )

لە بیلباو باران دەبارێت، لە جیهاندا باران دەبارێت. عاشق دەبێ بزانێت چۆن چۆنی وون دەبێت، و چۆن چۆنی پەیدا دەبێت. ئەو باش دەزانێت چۆن چۆنی هاوسەنگی ئەم دووانە بپارێزێت. لە کاتێکدا کە بۆ میوا نخانە دەگەڕاینەوە، شادە و گۆرانی دەڵێت:

Son Los Locos que inventaron el amor. ( دیوانەکان بوون کە ئەوینیان بنیاد نا. )

هەرچەندە هێشتا لە ژێر کاریگەری شەرابدام، بەڵام تۆزێك هاتوومەتەوە سەر خۆم. ئەگەر ئەمەوێت ڕۆژەکانی داهاتوو لەگەڵ ئەودا لە کۆچدا بم، دەبێت حاڵەتەکان بخەمەوە ژێر ڕکێفی خۆم.

خستنەوە ژێر ڕکێفی حاڵەتەکان ئاسانە، بۆچی من ئیحساساتی نیم. کەسێك کە دەتوانێت بەسەر دڵیدا زاڵ بێت، دەتوانێت جیهان ڕزگار بکات.

گۆرانی دەڵێت:

(Con un poena y un thrombon
A develarte el Corazon.)

( بە هۆنراوە و سازێك
دڵ بە تۆ دەدۆڕێنم. )

وادەزانم : ( حەز دەکەم دڵم دەستەمۆ نەکەم؟ ) ئەگەر بتوانم خۆم بە دەستەوە بدەم، هەتا ئەگەر تەنها بۆ ئەم کۆتا هەفتەیەش بێت، ئەم بارانە لەسەر گۆناکانم بۆنێکی تری دەبێت. ئەگەر ئەوین سادە و ساکار بێت، هەر ئێستا لە ئامێزم دەهێنایە دەرەوە، ئاوازی داستانێکی دەووت کە سەرگوزەشتەی ئێمە بوو. ئەگەر لە دوای پشوو، Zaragoza نەبوایە، حەزم دەکرد کاریگەری شەرابەکە هەرگیز تەواو نەبێت و بە مەستی بمێنمەوە، و ئازاد بم تا بە ئەو هەمان ئەو شتانە بڵێم و ببیستێت کە ئەویندااران دەیڵێن.

بەڵام نا. ناتوانم.

نامەوێ.

گۆرانی دەڵێت:

خەریکم باڵ دەگرمەوە، Salgamos a voltar, querida mia. خۆشەویستی من.

بەڵێ، باڵ بگرینەوە، بەڵام بە مەرجەکانی من.

هێشتا نەیدەزانی وەڵامی من بۆ بانگهێشتەکەی "بەڵێ" یە. بۆچی دەمەوێ دەست بدەمە ئەم کارە ترسناکە؟ چونکە لەم ساتەدا مەستم، وە لە دەستی ڕۆژگاری یەکرەنگیش ماندووم.

بەڵام ئەم ماندوویەتیە بەسەر دەچێ. وە دوایی دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ Zaragoza ، بۆ شارێك کە بۆ ژیان هەڵمبژاردووە. وانەکانم چاوەڕوانن، ئاشکردنەوەی دەوڵەتی چاوەڕوا نمە. مێردێك کە دەبێت بیدۆزمەوە چاوەڕوا نمە، دۆزینەوەی دژوار نییە.

ژیانێکی سادە لە چاوەڕوانیمدایە، لەگەڵ منداڵ و نەوەکاندا، لەگەڵ خەرجی هاوتا و پشووی ساڵانە. من لە ترسەکانی ئەو بێ ئاگام ، بەڵام ترسەکانی

خۆم دەناسم، پێویستم بە ترس گەلێکی تازە نییە.... هەر ئەو ترسانەی کە خۆم هەمە بەسە.

ناتوانم هەرگیز ناتوانم ئەویندارى کەسێکی وەکو ئەو بم. ئەو بە باشی دەناسم، ماوەیەك پێکەوە ژیاوین، لاوازی و نیگەرانیەکانی دەزانم. ناتوانم وەکو خەڵکی ڕاستی بکەمەوە.

دەزانم کە ئەوین و سەد "بەربەست" وەکو یەکن: ئەگەر ڕێگە بدەیت درزێکی بچووك دروست بێت کە تەنها بڕێکی کەم ئاو لێیەوە تێپەڕێت، کەم کەم تەواوی دیوارەکە دەڕوخێت ـــ وە ساتێك دێتە پێش کە هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێگری لەو ئاوە بکات.

ئەگەر دیوارەکە بڕوخێت، ئەوین هەموو شتێك دەگرێتە ئەستۆ، ئیتر گرنگ نییە بۆی کە (ممکن) چییە و (ناممکن) چییە، بۆی گرنگ نییە کە دەتوانین یا ناتوانین مەعشوقەکەمان لە پەنادا بێت یا لە پەنامانا نەبێت ـــ عەشق واتە ئختیاری لە دەستدان.

نەخێر، ناتوانین بە هیچ درزێك ڕازی بین. هەرچەندێکیش بچووك بێت.

ـــ (تەنها ساتێك!)

لەناکاو وازی لە گۆرانی ووتن هێنا. دەنگی پێیەکی توند لە پشت سەرمانەوە لەسەر فەرش ڕێژی بەردی شەقامەوە دەهات.

قۆڵی گرتم و ووتی: (بڕۆین.)

پیاوێك هاواری کرد: (پەلە مەکە! دەبێ لەگەڵ تۆدا قسە بکەم!)

بەڵام ئەو توندتر هەنگاوی هەڵدەگرت.

ووتی: (پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. بڕۆین بۆ میوانخانە.)

پەیوەندی بە ئێمەوە هەبوو: کەسێکی تر لەو شەقامەدا نەبوو. دڵم ئارامی لێبڕا و بەزوویی مەستیەکە لە سەرم پەڕی. بیرم کەوتەوە کە بیلباو لە ناوچەی

Basco یە و هێرشی تیرۆریستەکان زۆر بەر بلاوە تیایدا. هەنگاوەکان نزیک تر دەبوونەوە.
توندی کرد و ووتی : ( بڕۆین. )
بەلام ئیتر درەنگ بوو. پیاوێکی شەبەح، سەرتاپای تەڕ، هاتە نێوان هەردوومانەوە.
پیاوەکە ووتی: ( ئارام بن، تکاتان لێدەکەم! سوێندتان دەدەم بە خودا ئارام بگرن! )
زۆر ترسا بووم و بە دوای ڕێگەیەکدا دەگەڕام کە لێوەی هەڵبێم، بە دوای ئوتۆمۆبیلێکی پۆلیس کە لە ناکاو وەکو سەیر و سەمەرە دەرکەوێت. بەشێوەیەکی غەریزەیی قۆڵیم گرت ـــ بەلام دەستی لا بردم.
پیاوەکە ووتی: ( تکاتان لێدەکەم. هەواڵیان پێدام کە لە شاردان. پێویستم بە یارمەتیتان هەیە. کوڕمە. )
پیاوەکە چۆکی دادایە زەوی و دەستی بە گریان کرد.
ـــ ( تکاتان لێدەکەم! تکاتان لێدەکەم! )
ئەو هەناسەیەکی ساتری هەڵکێشا، سەری هێنایە خوارەوەو چاوەکانی داخست. چەند خولەکێك بە بێدەنگی مایەوە، و تەنها دەنگێك کە دەگەشتە گوێمان، دەنگی بارانی تێکەڵ بە گریانی ئەو پیاوە بوو کە چۆکی لە زەویدا دانابوو.
سەرەنجام ووتی: ( پیلار بڕۆ بۆ میوانخانە بخەوە. وا نازانم تا بەرەبەیان بگەڕێمەوە. )

# دوو شه‌ممه

# 1993/12/6

ئه‌وینی لێوان لێوه له داو. كاتێك ده‌یه‌وێت خۆی بنوێنێت، ته‌نها نوره‌كه‌ی پیشان ده‌دات ـــ وه ناهێڵێت سێبه‌ری ئه‌و نوره ببینین.

ووتی: ( سه‌یری زه‌وی ده‌ورو به‌رمان بكه. وه‌ره له‌سه‌ر زه‌وی ڕاكشێین و هه‌ست به لێدانه‌كانی دڵی زه‌وی بكه‌ین. )

وه‌ڵامم دایه‌وه: ( باشه با دوایی، نامه‌وێ ته‌نها پاڵتاوێك كه له‌گه‌ڵ خۆمدا هێناومه، پیسی بكه‌م. )

له ڕێگه‌یه‌كی دا پۆشراو به دره‌ختی زه‌یتون هه‌نگاومان ده‌نا. دوای له بارانی دوێنێ شه‌و له بیلباو، هه‌تاوه‌تاوی به‌ره‌به‌یان هه‌ستێكی خه‌ون ئامێزی به من ده‌به‌خشی. عه‌ینه‌كی فۆتۆم نه‌بووـــ هیچ شتێكم له‌گه‌ڵ خۆم نه‌هێنا بوو، چونكه بڕیار وا بوو هه‌ر ئه‌و ڕۆژه بگه‌ڕێمه‌وه بۆ Zaragoza . ده‌بێ به كراسیكه‌وه بخه‌وتمایه، كه به قه‌رز به منی دابوو، وه كراسێكیشم له ده‌ورو به‌ری میوا نخانه كڕی بوو تا یه‌كێكیان بشۆرم كه ئه‌وی كه‌یانم له‌به‌ردایه.

به ڕاشكاوانه ووتم: ( حه‌تمه‌ن كه من به یه‌ك جۆر جل و به‌رگه‌وه ده‌بینی، ماندوو بوویی. ) ده‌مویست بزانم بابه‌تێكی بێ بایه‌خ من ده‌گه‌ڕێنێته‌وه بۆ واقیع یان نا.

ـــ ( له‌وه‌ی كه لێره‌دای خۆشحاڵم. )

له‌و كاته‌ی كه مه‌دالیاكه‌ی به من به‌خشی، ئیتر سه‌باره‌ت به ئه‌وین هیچی نه‌ووتبوو، به‌ڵام زۆر خۆشحاڵ بوو وه‌ك ئه‌وه‌ی بۆ ته‌مه‌نی هه‌ژده ساڵی گه‌ڕابێته‌وه. له په‌نامه‌وه ڕێگای ده‌بڕی، ئه‌ویش له جوانی و ناسكی ئه‌م به‌ره به‌یانه هاتبووه بوونه‌وه.

ئاماژەم بە کێوەکانی پیرنە کرد و پرسیارم کرد: ( لێرە ئیشت چییە؟ )
بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: ( فەرەنسا لە پشت ئەو کێوانەوەیە. )
ـــ ( من شارەزاییم لە جوغرافیادا هەیە. تەنها دەمەوێ بزانم بۆچی دەبێ تا ئەو کێوانە بڕۆین؟ )
ماوەیەك هیچی نەووت و تەنها پێدەکەنی.
ـــ ( بۆ ئەوەی لەوێدا چەند ماڵێك ببینی. کە دەزانم، لەوانەیە بەلاتەوە سەرنج ڕاکێش بن. )
ـــ ( ئەگەر لە بیری ئەوەدای کە ببیتە مەلیك، فەرامۆشی کە. من پارەم نییە. )
بۆ من جیاوازی نەدەکرد بۆ لادێیەك بڕۆم لە Navara یا بۆ فەرەنسا بڕۆم.
تەنها نەمدەویست ڕۆژەکانی پشوو لە Zaragoza بەسەر بەرم.
بیستم کە مێشکم بە دڵمی ووت: ( دەبینی؟ لەوەی کە بە بانگهێشتەکەی ڕازی بوویی خۆشحاڵی. گۆڕانکاریت بەسەردا هاتووە و هەستی پێناکەی. )
نەخێر، هیچ نەگۆڕا بووم. تەنها کەمێك ڕاحەت تر بوو بووم.
ـــ ( سەیری بەردەکانی سەر ڕووی زەوی بکە. )
خڕ بوون و هیچ گۆشەیەکیان نەبوو. لە بەردەکانی کەناری دەریا دەچوون.
بەلام لێرە، لە دەشتەکانی Navara هەرگیز دەریایەك بوونی نەبووە.
ووتی: ( قاچەکانی کاریگەران، قاچەکانی داستان بێژان ئەم بەردانەیان تیژ کردۆتەوە، ئەوانە گۆڕراون و کۆچەرییەکانیش گۆڕراون. )
ـــ ( لە کۆچدا فێری ئەم هەمووە شتە بووی؟ )
ـــ ( نەخێر، سەیر و سەمەرەی کەشفکەر زۆرن. )
تێنەگەشتم، هەوڵیشم نەدا لە بابەتەکەدا ڕۆبچم و لەسەری بڕۆم. نووقمی هەناو بووم، لە دەشتدا، لە کێوە بەرزەکاندا.

پرسيارم كرد: ( ئێستا بۆ كوێ دەڕۆين؟ )

ـــــ ( بۆ هيچ شوێنێ. لە بەرەبەيان، لە هەتاو، لەم سروشتە جوانە چێژ وەردەگرين. كۆچێكى درێژمان لە ڕێگادايە بە ئوتۆمۆبيل. )

ساتێك ڕاوەستاو پرسيارى كرد:

ـــــ ( مەداليـاكەت هەڵگرتووە. )

وە بە خێرايى هەنگاو هەڵدەگرم و نامەوێ تيشك بخەمە سەر ئەو بابەتە و ئاماژەى پێبكەم ـــــ لەوانەيە شادى و ئازادى ئەم بەرەبەيانە بخاتە مەترسيەوە.

لادێيەك دەردەكەوت. كە لە لادێكانى سەدەى ناوەڕاست دەچوو، كە لەسەر گردێك بوو، وە دەمتوانى لە دوورەوە گومەزى كەنيسە و قالا وێرانەكانى ببينم.

پێشنيار دەكەم: ( بڕۆم و ئەو شوێنە لە نزيكەوە ببينم. )

گومانى هەيە، بەڵام سەرئەنجام ڕازى دەبێت، لە ڕێگەدا كەنيسەيەكى بچووك هەيە و حەز دەكەم بچمە ناويەوە. ئيتر دۆعا و پاڕانەوە كردن نازانم، بەلام بێدەنگى كەنيسەكە هەميشە ئارامم دەكاتەوە.

بە خۆم دەڵێم: ( هەست بە تاوان مەكە. ئەگەر ئەو ئەويندارە، ئەوە كێشەى خۆيەتى. )

سەبارەت بە مەدالياكە پرسى. دەزانم كە چاوەڕوانى ئەوميە سەرى قسە دا بمەزرێنێت. هەر لەو كاتەدا، لە بيستنى ئەو شتانەى نايەوێ بيانبيستێ، دەترسێ. هەر لەبەر ئەوە درێژەى پێنەدا و كۆتايى بە بابەتەكە هێنا.

لەوانەيە بە ڕاستى منى خۆش بوێت. بەلام دەتوانين ئەم ئەوينە بە شتێكى جياواز، بە شتێكى ساتراَ تر بگۆڕينەوە.

له‌گه‌ڵ خۆمدا بیر ده‌که‌مه‌وه: ( گاڵته ئامێزه. شتێك ساتراَ تر له ئه‌وین بوونی نییه. له چیرۆکه‌کانی منداڵاندا، شازاده خانمه‌کان بۆقه‌کان ماچ ده‌که‌ن تا بگۆڕرین به شازاده. به‌ڵام له ژیانی واقعیدا (ییرسا)، شازاده خانمه‌کان شازاده‌کان ماچ ده‌که‌ن و شازاده‌کان ده‌گۆڕرێن به بۆق.)

دوایی نزیکه‌ی نیو کاتژمێر ڕێگا برین به پێ، ده‌گه‌ین به که‌نیسه‌که. پیره پیاوێك له‌سه‌ر پله‌کانیدا دانیشتووه.

یه‌که‌مین که‌سێکه که له یه‌که‌مین هه‌نگاوی ڕێگا بڕینه‌وه ده‌یبینین ـــ چونکه کۆتایی زستانه، وه ده‌شته‌کانیش ڕزگار بوون و ئاهێکیان به به‌ردا هاتووه‌ته‌وه ـــ تا زه‌وی باوه‌ڕ به به‌ره‌که‌ته‌که‌ی بکات و ڕێگه بدات مرۆڤه‌کان به ئاره‌قی ناوچاوانیان نانی خۆیان به ده‌ست بێنن.

ئه‌و به پیاوه‌که ده‌ڵێت: ( ڕۆژ باش.)

ـــ ( ڕۆژ باش.)

ـــ ( ناوی ئه‌م لادییه چییه؟ )

ـــ ( San Martin de Unx )

ده‌ڵێم: ( Unx ) ؟ ئه‌م ناوه هه‌ر ئه‌ڵێی ناوی دێوه‌کانه !

پیره پیاوه‌که نازانێ که ئێمه گاڵته ده‌که‌ین. به بێزاری و مه‌ئوییسی، ڕوو به ده‌رگای که‌نیسه ده‌ڕۆم.

پیره پیاوه‌که ده‌ڵێت: ( ناتوانیت بچیته ژووره‌وه. نیوه‌ڕوان کاتی پشووه. ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت، ده‌توانیت کاتژمێر چواری دوای نیوه‌ڕۆ بگه‌ڕێیته‌وه.)

ده‌رگا کراوه‌یه. ناوه‌وه ده‌بینین ـــ هه‌رچه‌نده به ڕوونی نایبینین و ڕووناکی ده‌ره‌وه ڕێگره له بینینی ناوه‌وه.

ـــ ( ته‌نها یه‌ك خوله‌ك. ده‌مه‌وێ بپارێمه‌وه و دۆعا بکه‌م. )

ـــ ( زۆر به‌داخم. به‌ڵام کاتی پشووه. )

ئەو گوێ بۆ گفتەکانی پیرە پیاوەکە ڕادەگرێت و هیچ نالێت.
دەڵێم: ( باشە، بڕۆین. مشت و مڕ کردن سوودی نییە. )
ئەو بە سەرسوڕمانەوە سەیرم دەکات، سەیر کردنەکەی خاڵییە، دوورە.
دەپرسێت: ( ناتەوێ کەنیسەکە ببینی ؟ )
دەزانم حەزی بە ڕەفتار کردنەکەم نەکردووە. حەتمەن وا دەزانێت من لاواز و ترسنۆکم، وە ناتوانم بۆ ئەو شتەی دەمەوێت، بجەنگم. پێویستی بە ماچ نەبوو، شازادە خانم خۆی بووە بە بۆق.
دەڵێم: ( دوێنێت لە بیرە؟ گفتوگۆکانت چەند جارێك بڕی، چونکە مەیلت نەبوو قسەی لەسەر بکەی، ئێستا کە من هەر ئەو کارە دەکەم، ڕەخنەم لێدەگری. )
پیرە پیاوەکە، بێ جیاوازی شاهیدی مشت و مڕەکەی ئێمەیە. حەتمەن خۆشحاڵە کە لەم شوێنەدا، لەبەر چاوی، خەریکە ڕووداوێك ڕوو دەدات ــــ شوێنێك کە هەموو بەیانیەکان، هەموو عەسرەکان و هەموو شەوەکانی وەکو یەکە.
ئەو ڕوو دەکاتە پیرە پیاوەکە و دەڵێت: ( دەرگای کەنیسەکە کراوەیە. ئەگەر پارەت دەوێ دەتوانین بڕێك پارەت بدەینێ. بەلام ئەو دەیەوێت کەنیسەکە ببینێت. )
ــــ ( ئیتر کاتی بینین نییە و کاتی بینین بەسەر چووە. )
ــــ ( باشە، کەوایە بە هەر شێوازێك بووە دەچینە ژوورەوە. )
قۆڵم دەگرێت و دەڵێ دەچینە ژوورەوە.
دڵم لێدەدات. لەوانەیە پیرە پیاوەکە توند و تیژی بنوێنێ، پۆلیس ئاگادار کاتەوە، گەشتەکەمان لێ تێك بدات.
ــــ ( بۆچی وا دەکەی ؟ )
ــــ ( چونکە تۆ دەتەوێ بچیتە ناو کەنیسەکەوە. )

بەلام ناتوانم بە ووردی سەرنج بدەم کە لە ناو کەنیسەکەدا چی هەیە : ئەو مشت و مڕ ـــ و ڕەفتارەم ـــ بە داخەوە ئەو بەرەبەیانە پاك و بەرزەی لەناو بردووە.
گوێم زۆر بەهەستە بەوەی کە لە دەرەوە ڕوودەدات ـــ هەر ساتێك تەصویری پیرە پیاوەکە دەبینم کە دەڕوات و پۆلیسی لادێ دەبینم کە دێت. هێرش بەرانی کەنیسە. دزەکان. خەریکی کاری ناپەجێ دەکەن، یاسا دەخەنە ژێر پێیان.
پیرە پیاوەکە ووتی کاتی پێشوو، ئێستا کاتی چوونە ژوورەوە نییە ! پیرە پیاوێکی بێ چارەیە، نەیتوانی ڕێگری لە ئێمە بکات ـــ وە پۆلیس ترسناك تر دەبێت، چونکە بێ ڕێزیمان لەگەڵ پیرە پیاوێکی بەساڵا چوودا نواندووە.
ئەنها ئەوەندە لە ناو کەنیسەکەدا دەمێنمەوە کە وا خۆم پیشانی بدەم خوێن سارد و ئارامم. دڵم ئەوەندە توند لێی دەدا کە دەترسام ئەو بیبیستێت.
کاتێ هەست دەکەم ماوەیەکی پێویست بۆ خوێندنی دۆعای " ئاوازی ماریا" لێرەدا ماوینەتەوە، دەڵێم : ( دەتوانین بڕۆین. )
ـــ ( مەترسە پیلار. ناتوانی وەکو ئەکتەرێك دەور ببینیت. )
نەمدەویست کێشەی خۆم لەگەڵ ئەو پیرە پیاوەدا بە کێشەیەك لەگەڵ ئەودا بگۆڕمەوە. دەبوایە ئارام و لەسەرخۆ بوومایە.
وەڵامم دایەوە: ( نازانم وەکو ئەکتەرێك دەور بینین چ واتایەکی هەیە. )
ـــ ( هەندێك کەس لە هەندێکی تر زوویر دەبن و دەنگ دادەبڕن، لە خۆشیان زوویر دەبن، لە ژیانیش زوویر دەبن. لە دوایدا کەم کەم لە مێشکیاندا دەست دەکەن بە سازکردنی دۆکیومێنت و نمایشنامە بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئەهامەتیەکانی خۆیان بنووسن. )
ـــ ( زۆرێك لەم کەسانە دەناسم. نازانم مەبەستت چییە. )

ـــــ ( بەلام لەمانە خراپتر، كەسانێك هەن كە ناتوانن ئەم دۆكيومێنتـە لـە تەنيايدا پێـشكەش بكـەن، لەبـەر ئـەوە ئەكتـەرەكانى تـريش بانگهێـشت دەكەن. )

ئەمە هەر ئەو كارەيە كە ئەو كردى. دەيوويست تۆڵە لە شتێك بكاتەوە، وە بۆ ئەم كارەش منى هەڵبژارد. ئەگەر بە قەدەغە كراوەكانى ئـەو ڕازى دەبـووين، ئێستا پەشيمان و تێكشكاو بووين.

تووڕيى ئەم پياوە ئاشكرا بوو، دووركەوتنەوە لە كارى ئەكتەرى ئاسـان بـوو. بەلام خەڵكى ئێمە بانگهێشت دەكەن كە دەورى قوربـانى ببيـنين، بـۆ نمونـە كاتێ لە نەبوونى داد پەروەرى شكايەت دەكەن، دەيانەوێ خەڵكى ڕازى بێت بەو نـەبوونى داد پـەروەرى، بـيرو بۆچـوونى خۆيـان دەربـڕن، بـۆ ئـەوەى ببنـە هاوكاريان. )

چاوەكانى بڕييووە چاوا نمەوە.

ووتى: ( ئاگات لە خۆت بێ. كاتێ بچيتە نـاو ئـەم ياريیـەوە، هەميـشە بـە دۆڕاوى دێيتە دەرەوە. )

حەق لاى ئەو بوو. بەم شێوەيە، لێرەدا هيچ هەستێكى خۆشم نەبوو.

ـــــ ( ئێستا پاڕاومەتەوە. ئەو كارەى كە ووويـستوومە ئـە نجامم داوە. ئێـستا دەتوانين بڕۆين. )

ڕۆشتينە دەرەوە. لە نێوان تاريكى ناو كەنيسە و هەتاوەتاوى بەهێزى دەرەوەدا چەند چركەيەك چاوانم نەياندەبينى. هەر ئەوەندەى چاوم بە هەتاو ڕاهات، سەيرم كرد پيرە پياوەكە لێرەدا ديار نەماوە.

ئەو ڕوو بە لادێكە كەوتە ڕێگا و ووتى: ( بڕۆين نانى نيوەڕۆ بخۆين. )

لەكاتى خواردنى نانى نيوەڕۆدا، دوو ليوان شەراب دەخۆم. هەرگيز لە ژيانمدا بەم شێوەيە شەرابم نەخواردووە. خەريكە دەبم بە كەسێكى ئەلكحولى.

ــــ (چەندە زيادە ڕۆيى ئەكەم!)

لەگەڵ خزمەتكارەكەدا قسە دەكات. دەزانێت وێرانە گەلێكى ڕۆمى زۆر لەم دەورو بەرەدان. هەوڵ دەدەم لە گفتوگۆ كردندا بەشدارى بكەم، بەلام ناتوانم بەد ڕەوشتى خۆم بشارمەوە.

شازادە خانم بوو بە بزن. چ گرنگييەكى هەيە؟ ئەگەر بە دواى شتێكدا نيم، بە دواى پياودا، بە دواى ئەويندا، بۆچى دەبێ شتێك بە كەسێك سابت بكەم؟

وا دەزانم: (دەمزانى، دەمزانى كە خەريكم دنيا تێك و پێك ئەيەم و دەيشێوێنم. مێشكم ئاگادارى كردبوومەوە ــــ وە دڵم نەيوويست پەيڕەوى ئامۆژگاريەكانى بكات.)

بۆ ئەو شتانەى كە هەمە، كە نرخێكى زۆرم پێداون. ناچار بووم دەست لە هەموو ئەو شتانە هەڵبگرم كە هەمبوو، بێزار بووم لە ڕێگايەكى زۆر كە لە بەر دەممدا بوو. خەونەكانم كردە قوربانى لە پێناو خەونێكى بە ناو گەورەتر ــــ ئارامى ڕۆح. نامەوێ ئەم ئاراميە لە دەست بدەم.

گفتو گۆكەى لەگەڵ خزمەتكارەكەدا بڕى و ووتى: (تووڕەيت.)

ــــ (بەڵێ، تووڕەم. وا دەزانم ئەو پيرە پياوە ڕۆشت پۆليس ئاگاداركاتەوە. وا دەزانم ئەم لادێيە بچووكە و دەزانن لە كوێدا بماندۆزنەوە و دەستگيرمان بكەن. وا بزانم تۆ دەتەوێ هەر لێرەدا نانى نيوەڕۆ بخۆين، ئەمەش پشووەكەمان خراپ دەكات.)

دەبەى ناوى موقەتەرى دەسوڕاندەوە. حەتمەن دەزانيت كە بەم شێوەيە نييە ــــ كە لە ڕاستيدا شەرمەزارم. بۆچى ئەم كارە لەگەڵ ژيانماندا دەكەين؟

بۆچی کا "پوش" لە چاوی خۆماندا دەبینین و کێو، دەشت و درەختەکانی زەیتون نابینین ؟

ـــ ( گوێ بگرە: هیچ یەکێك لەم ڕووداوانە ڕوونادات، پیرە پیاوەکە ڕۆشتووەتەوە بۆ ماڵەوە و ئەو مەسەلەیەش لەبیر خۆت بەرەوە. باوەڕم پێ بکە. )

وا دەزانم: ( لەبەر خاتری ئەوە تووڕە نیم، گێلە ! )

درێژەی پێدەدا: ( زیاتر گوێ بۆ دڵت بگرە. )

وەڵام دەدەمەوە: ( بە تەواوی وایە: خەریکم گوێ دەگرم. وە پێشنیار دەکەم لێرە بڕۆین. حاڵم باش نییە. )

ـــ ( ئیتر لە ڕۆژدا مەی مەهەتاوەوە. هیچ یارمەتییەکت نادات. )

تا ئەم ساتە خۆمم گرت. پێم وایە باشتر وایە هەرچییەك كە ئەمەوێ بیلێم.

دەڵێم: ( وا دەزانی کە لە ساتە جادووییەکان دەگەیت، ئیتر هەموو شتێك دەزانی. نازانم چی دەکەیت لە پەنای مندا. )

پێدەکەنێت و دەڵێت:

ـــ ( چاکسازیت دەکەم. وە چاکسازی ئەو بەرامبەرکێیەش دەکەم کە لەگەڵ دڵت دەستت پێکردووە. )

ـــ ( کام بەرامبەرکێ ؟ )

وەڵام دەداتەوە: ( هیچ. )

بەلام دەزانم مەبەستی چییە.

وەڵام دەدەمەوە: ( خەیاڵاتەکان بخەرە ئەو لاوە. ئەگەر بتەوێ، دەتوانین لە بارەیەوە بدوێین. تۆ سەبارەت بە هەستەکانی من لە هەڵەدایت. )

لە سوڕانەوەی دەبەکە واز دێنێت و سەیرم دەکات:

ـــ ( من ئامادە نیم. دەزانم کە منت خۆش ناوێ. )

لەمە زیاتر سەرگەردانم دەکات.

درێژەی پێدەدا: ( بەڵام من لە پێناویدا دەجەنگم. لە ژیاندا شتانێك هەیە كە بەهای ئەوەیان هەیە كە مرۆڤ تا كۆتایی تەمەنی لە پێناویاندا بجەنگێت. )

بۆ وتەکانی هیچ وەڵامێکم نییە.

دەڵێت: ( تۆ بەهایان دەزانیت. )

چاوم بۆ شوێنی تر دەگێڕم و هەوڵ ئەدەم وا خۆم پیشان بدەم كە دیكۆراتەكانی ڕستورانەكە سەرنجیان ڕاكێشاوم. هەستی پۆڵێكم هەبوو، ئێستا دووبارە بوومەوە بە شازادە خانم.

سەیری تابلۆیەك لە ماسی گران و كەشتیەكان دەكەم و بیریان لێدەكەمەوە:

ــــ ( دەمەوێ باوەڕ بە قسەكانی بكەم. هیچ شتێك ناگۆڕێت، بەڵام هیچ نەبێ ئەوەندە هەست بە لاوازی و بێ نرخی ناكەم. )

دەڵێم: ( داوای لێبووردن دەكەم لەبەر توندیم. )

پێدەكەنێت. بانگی خزمەتكارەكە دەكات و پارەی دانیشتنەكەمان ئەدات.

لە ڕێگای گەڕانەوەدا گێژترم. لەوانەیە بەهۆی هەتاوەتاوەوە بێت ــــ بەڵام نا، وەرزی پایزە و هەتاوەتاوەكەی زۆر بە تین نییە. لەوانەیە بەهۆی ئەو پیرە پیاوەوە بێت ــــ بەڵام پیرە پیاوەكە ماوەیەكە لە ژیانی من ڕۆشتووەتە دەرەوە.

لەوانەیە بە هۆی هەر شتێكی نوێوە بێت. پێڵاوی نوێ ناڕەحەتكەرە. ژیان جیاوازی نییە: غافڵگیرمان دەكات، وە ئاگادارمان دەكات ڕوو بە نەناسراو و نامۆكان بڕۆین ــــ هەندێ جار ئامانەوێ، هەندێ جاریش پێویستمان بەم كارە نییە.

هەوڵ دەدەم لە سروشت وورد ببمەوە، بەڵام ئیتر ناتوانم زەیتون زارەکان، شارۆچکەی سەر کێوەکە و کەنیسەیەك ببینم کە پیرە پیاوێك لە پەنای دەرگاکەیدا دانیشتبوو. هیچ یەکێك لەمانە بۆ من ئاشنا نییە.

دەکەومە بیری مەستی دوێنێ شەو، وە گۆرانییەك کە ئەو ئەیووت.

Las tardicitas de Buenos Aires tienen est no se…..

Que se yo ?

Viste, Sali de tu casa, por Arenales….

نازانم زەردەپەڕەکانی " Buenos Aires " چی هەیە....

چی دەزانم؟

دیدگایەك لە لایەن "Arenales"، لە ماڵەکانت ڕۆشتم....

بۆچی " Buenos Aires "، ئێمە کە لە بیلباو بووین. ئەم شەقامی "Arenales" چییە؟ چی دەوویست ؟

دەپرسم: ( دوێنێ شەو چ گۆرانیەك بوو کە ئەتووت ؟ )

دەڵێت: ( غەزەلێك بۆ دێوانەیەك. بۆچی تا ئەمڕۆ ئەتپرسیوە ؟ )

وەڵام دەدەمەوە: ( هەروا. )

بەڵام بۆچی، خەیاڵاتێکم هەیە. دەزانم بۆچی ئەم گۆرانییەی ئەووت، چونکە داوێك بوو. ئاگاداری کردمەوە کە هەمووی لەبەر بکەم ـــ وە من دەبێت وانەی تاقیکردنەوەکانم لەبەر بکەم. دەیتوانی گۆرانیەکی ناسراو بڵێت، کە هیچ نەبێ هەزار جار بیستبێتم ـــ بەڵام هەوڵی دەدا گۆرانییەك بڵێت کە هەرگیز نەمبیستبێت.

تەنها داوێکە. بەم شێوەیە، دەیویست کاتێ لە دوایدا ئەم گۆرانییانە لە ڕادیۆ، یا لە دیسکۆیەکدا ببیستم، بکەومەوە یادی ئەو ، یادی بیلباو، یادی دەورانێك کە پایزی ژیانم دووبارە بوو بوویەوە بە بەهار. بە یادی ئەو جۆش و

خرۆش، و ئەو داستان و منداڵییە دەکەومەوە کە خودا دەزانێت لە کوێ دووبارە لە ملدا دروست بوویەوە.

پیری لە هەموو ئەم شتانە کردۆتەوە، بە ئەزموونە و سەرما و گەرمای چەشتووە و دەزانێت چۆن ئەو ژنەی دەیەوێت، بە دەستی بێنێت.

بە خۆم دەڵێم: ( خەریکە دێوانە دەبم. ) تەنها لەبەر ئەوەی دوو ڕۆژی لە دوای یەك مەیم خواردۆتەوە، گومان دەبەم بووم بە کەسێکی کحولی. گومان دەبەم ئەو ئەواوی فێڵەکان دەزانێت. گومان دەبەم بە میهرەبانییەکانی منی خستووەتە ئەختیاری خۆیەوە و دەستی بەسەردا گرتووم.

لە ڕستوراندا وتی: ( چاکسازی ئەو بەرامبەرکێیە دەکەم کە لەگەڵ دڵت دەستت پێکردووە. )

بەڵام هەڵە دەکات. چونکە ئیتر ماوەیەکی زۆرە لەگەڵ دڵمدا جەنگاوم و بەسەریدا سەرکەوتووم. نامەوێ ئەویندارێکی نەگونجاو "ناممکن" بم.

سنوورەکانم و تواناکانم بۆ ڕەنج کێشان دەناسم.

کاتێ دووبارە ڕوو بە ئوتۆمۆبیلەکە بە ڕێ کەوتین، دەڵێم: ( سەبارەت بە شتێك بدوێ. )

ـــ ( سەبارەت بە چی ؟ )

ـــ ( هەر شتێك. لەگەڵ مندا بدوێ. )

دەست دەکات بە قسە کردن سەبارەت بە خۆپیشاندانی مەریەمی مەسیح لە Fatima . نازانم ئەم باسەی لە کوێوە هێناوە ـــ بەڵام دەتوانم خۆم سەرقاڵ بکەم بە داستانی سێ شوان کە لەگەڵ مریەم دا گفتوگۆیان کردووە.

کەم کەم دڵم ئارام دەگرێت. بەڵێ، من سنوورەکان باش دەناسم و دەتوانم خۆم کۆنترۆڵ بکەم.

شەو گەشتین، لە مانگە شەوێکی لێڵدا کە نەماندەتوانی بە تەواوەتی بـزانین لە کوێداین. تەنها مەیـدانێکی بـچووك، گلـۆپێکی شـەقام، چـەند مـاڵێکی سەدەی ناوەڕاست کە بە نوری زەرد ڕووناك بوو بوونەوە و چاڵێکم دەبینی.

هاتە جۆش و خرۆش و ووتی: ( مانگ ! )

تێنەگەشتم.

گفتەکەی تەواو کرد: ( لە "سەن ساوەن"داین. )

ئەم ناوە هیچ واتایەکی بۆ من نەبوو. بەڵام لە فەرەنسادا بووین، وە ئەمـەش هێنامیە جۆش و خرۆشەوە.

پرسیم: ( بۆچی لێرە ؟ )

بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: ( لەبەر ئەو خانووانەی کە دەمـەوێ بـە تـۆی بفرۆشم. لەوە تێپەڕیوە، بەڵێنم داوە ڕۆژی جەژنی " لقاح مقـدس" بـۆ ئێـرە بێم. )

ـــــ ( بۆ ئێرە ؟ )

ـــــ ( هەر ئەم نزیکانە. )

ئوتۆمۆبیلەکەی ڕاگرت. کاتێ دابەزین، دەستی گـرتم و لـەو مانگـە شـەوەدا هەنگاومان دەنا.

ووتی: ( ئەم شوێنە بەبێ ئەوەی کە چاوەڕوانیم لێـوەی هـەبێت، هاتـە نـاو ژیانمەوە. )

بیرم کردەوە: ( تۆش هەر بەو شێوەیە. )

ـــ ( ڕۆژێك لێرە بیرم دەکردەوە کە ڕێگەکەمم وون کـردووە. وە ئەسـڵەن بـەو شێوەیە نەبوو: لە ڕاستیدا، ڕێگەکەمم دۆزیبوویەوە. )

ووتم: ( بۆچی بە جفرە دەدوێیت و بە ڕوونتر نادوێیت ؟ )

ـــــ ( لێرەدا بوو کە زانیم جێگەت چەندە چۆڵە لە ژیانی مندا. )

دووباره چاوم به ده‌ور و به‌ردا گێرا نازانم بۆچی.

ـــ ( ئه‌مه چ په‌یوه‌ندییه‌كی به دۆزینه‌وه‌ی رێگاته‌وه هه‌یه ؟ )

ـــ ( برۆین ژوورێك بگرین، چونكه ته‌نها دوو میوانخانه‌ی ئه‌م شاره، ته‌نها هاوینان كراونه‌ته‌وه. دوایی له رستورانێكی باشدا نانی ئێواره ده‌خۆین ـــــ به‌بێ بوونی ترس له پۆلیس، به‌بێ ئه‌وه‌ی كه پێویست بێت خه‌می ئه‌وه بخۆین كه ده‌بێ به ئوتۆمۆبێل بگه‌رێینه‌وه.

كاتێ مه‌ی زمانی كردینه‌وه، به درێژی گفتوگۆ ده‌كه‌ین. )

پێكه‌وه پێكه‌نین. ئیتر زۆر ئارام تر بوو بوومه‌وه. به درێژایی كۆچ، له هه‌ندێ بیرو بۆچونی نارِه‌وا گه‌شتم كه رێگه‌م پێدا بوون بێنه ناو ده‌رونمه‌وه. كاتێ كه به‌سه‌ر لوتكه‌ی ئه‌و كێوانه‌دا تێپه‌ر ده‌بووین كه فه‌ره‌نسایان له رِوسیا جیا ده‌كرده‌وه، له خوام وویست كه رِۆحم له ترس و له‌رز پاك بكاته‌وه.

ئیتر له ده‌ور بینینی مندالأنه ماندوو بوو بـووم، له رِه‌فتاری وه‌كو زۆربه‌ی دۆسته‌كانم كه له ئه‌وینی "ناممكن" ده‌ترسان و به ته‌واوه‌تی نه‌یانده‌زانی ئه‌وینی ناممكن چیه‌یه. ئه‌گه‌ر هه‌ر به‌و شێوه‌یه به‌رده‌وام بوومایه، ته‌واوی ئه‌و خۆشیانه‌م له ده‌ست ده‌دا كه ئه‌و ده‌یویست له‌و چه‌ند رِۆژه‌دا به منی ببه‌خشێت.

بیرم كرده‌وه: ( ئاگادار به. ئاگاداری درز تێبوونی سه‌ده‌كه به. ئه‌گه‌ر درزی تێ ببێت، له‌م دنیایه‌دا هیچ شتێك ناتوانێت بیوه‌ستێنێته‌وه و سه‌دی بكات. )

ووتی: ( كه‌وایه داواكارین كه كچه مریه‌م له‌مه‌و به دوا هیدایه‌ت و رێنموونیمان بكات. )

هیچم نه‌ووت.

پرسیاری كرد: ( بۆچی نه‌تووت ئامین ؟ )

ـــ ( چونكه ئیتر وا نازانم گرنگ بێت. ده‌ورانێك بوو كه مه‌زهه‌ب به‌شێك له ژیانمی پێك ده‌هێنا، به‌لأم ئه‌و ده‌ورانه به‌سه‌ر چووه. )

نیو خولی خوارد و گەڕاینەوە بۆ لای ئوتۆمۆبیلەکە.

درێژەم پێدا : ( هێشتا هەر دۆعا دەکەم. کاتێ لە کێوەکانی پیرنە تێپەڕ دەبووین، ئەم کارەم کرد. بەڵام ئەمە ڕەفتارێکی خۆ کردە، گومان ناکەم وەها باوەڕێکم هەبێت. )

ـــــ ( بۆچی ؟ )

ـــــ ( چونکە ڕەنجم کێشاوە و خودا دەنگی نەبیستووم. چونکە لە ژیانمدا هەوڵم داوە لە ناخی دڵەوە ئەوین بە دەست بێنم، وە سەرئەنجام ئەو ئەوینە خراوەتە ژێر پێ وە، وە خیانەتیان لێکرد. ئەگەر خوداوەند ئەوینە.دەبێت زیاتر چاودێری هەستی من بێت. )

ـــــ ( خوداوەند ئەوینە. بەڵام تاکە کەسێك بە باشی لەم بابەتە دەگات، کچە مریەمە . )

قاقا پێکەنیم. کاتێ دووبارە ڕووم لە ئەو کردەوە، بینیم کە زۆر جدییە ـــــ گاڵتە ئامێزێك نەبوو.

درێژەی پێدا : ( کچە مریەم لە ڕاز و نهێنی تەسلیمی موتڵەق دەگات، وە لەبەر ئەوەی عەشقی بە دەست هێنا و ڕەنجی کێشا، ئێمەی لە ڕەنج کێشان ڕزگار کرد. هەر بەو شێوەیەی کە عیسا ئێمەی لە باری تاوان ڕزگار کرد. )

وویستم پێکەنینێکی بێ پێك قەرەبوو بکەمەوە، وویستم لەوە تێبگات کە ڕێز لە باوەڕەکەی ئەو دەگرم. سەبارەت بە باوەڕ و ئەوین مشت و مڕ ناکرێت، ئەویش لە وەها لادێیەکدا.

دەرگای ئوتۆمۆبیلەکەی کردەوە و دوو جانتای هێنایە دەرەوە. کاتێ وویستم جانتاکەی خۆمی لە دەست بگرم، پێکەنی.

ووتی : ( بێڵە با خۆم جانتاکەت بهێنم. )

بیرم كردەوە: (ماوەیەكی زۆرە هیچ كەسێك بەم شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵمدا نەكردووە.)

لە یەكەمین دەرگامان دا: ژنێك ووتی ژوورمان بۆ كرێ نییە. دەرگای دووەم كەس نەیكردەوە. لە پشت دەرگای سێیەم، پیرە پیاوێكی میهرەبان بە باشی پێشوازی لێ كردین ــ بەلام كاتێ سەیری ژوورەكەمان كرد، سەیرمان كرد تەنها یەك شوێن خەوی دوو نەفەری هەیە. من ڕازی نەبووم.

وەلامی دایەوە: (ژوورێك پەیدا دەكەین. داستانی " Exercisio do Outro" "ڕاهێنانێكی تر" ت بیستووە؟ بەشێكە لە داستانێك كە سەد ساڵ لەمەو پێش نوسراوە، نووسەرەكەی....)

ووتم: ( لە نووسەرەكەی گەڕێ، باس لە داستانەكە بكە.) وە جارێكی تر لە مەیدانی "سەن ساوەن" پیاسەمان دەكرد.

پیاوێك بە دۆستێكی دێرین دەگات كە هەوڵی داوە ژیانی خۆی دروست بكات، بەلام نەیتوانیوە. پیاوەكە بیر دەكاتەوە: (خراپ نییە پارەیەكی بدەمێ.) بە ڕێكەوت، هەر ئەو شەوە، تێدەگات كە دۆستە دێرینەكەی سەرمایە دارە و دەیەوێ قەرەبووی تەواوی خراپییەكانی بكاتەوە كە بە درێژای ساڵ ئەنجامی داوە.

دەچنە بارێكەوە و پیاوەكە مەی بۆ هەمووان داوا دەكات. كاتێ هۆی ئەم سەركەووتووییەی لێ دەپرسن، وەلام دەداتەوە كە تا چەند ڕۆژ لەمەو پێش لە جێگەی "كەسێكی تردا" ژیانم بەسەر بردووە.

پرسیار دەكەن: (كەسێكی تر كێیە؟)

ــ (كەسێكە كە فێریان كردم كە من ئەو بم، بەلام من نیم. "كەسەكەی تر" بڕوای وایە كە مرۆڤ ناچارە تەواوی ژیانی بیر لەوە بكاتەوە كە چۆن

ئەوەندە پارە کۆ بکاتەوە کە کاتێ پیر بوو، لە برسا نەمرێت. ئەوەندە بیر دەکاتەوە و بەرنامەی بۆ دادەڕێژێت کە تەنها کاتێ تێدەگات زیندووە کە ڕۆژگاری لەسەر زەوی کۆتایی پێهاتووە. بەلام ئیتر زۆر درەنگی کردووە. )

ـــ ( وە تۆ، تۆ کێیت ؟ )

ـــ ( من کەسێکم وەکو ئێوە، ئەگەر گوێ بۆ ئاوازی دلمان ڕادێرین. کەسێك کە لە بەرامبەر ڕازی ژیان سەرسام دەبێت، کە دلی بە ڕووی موعیزەکاندا کراوەیە، کە لەو کاتەدا چی دەکات، هەست بە شادی و ئەویننداری دەکات. تەنها "کەسێکی تر" لە ترسی نائومێدی، نەیدەهێشت من بەم شێوەیە ڕەفتار بکەم. )

ئامادەبووان چەند جارێك ووتیان : ( بەلام ڕەنج بوونی هەیە. )

ـــ ( تێکشکاندن بوونی هەیە. بەلام هیچ کەسێك سلی لێناکاتەوە. هەر لەبەر ئەوە، باشتر وایە مرۆڤ لە چەند ئەبەردیەکدا بدۆڕێ لەبەر خەونەکانی تا تێکدەشکێت، بێ ئەوەی بزانێت لە پێناوی چیدات دەجەنگێت. )

ئامادەبووان پرسیان : ( هەر ئەوەندە ؟ )

ـــ ( بەلێ. کاتێ لەمە گەشتم، بەخەبەر هاتم، بڕیارم دابوو کە هەمان ئەو کەسە بم کە بە ڕاستی دلم دەیوویست ببم. "کەسەکەی تر" لێرە بوو، لە ژوورەکەمدا، سەیری دەکردم، بەلام ئیتر ڕێگەم نەدا بێتە ژوورەوە ـــــ هەرچەندە چەند جارێك هەولیدا بمترسێنێت، منی بە ئاگا دەهێنایەوە کە ئەگەر بیر لە داهاتوو نەکەمەوە، لە مەترسیدا دەبم. لەو ساتەوەی کە

"كه‌سه‌كه‌ی تر"م له‌ ناو ژیانم كردۆته‌ ده‌رموه‌، ووزه‌ی سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ ئاسای ڕووناكی به‌خشم بۆ گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌. )

هه‌ر به‌م شێوه‌یه‌ به‌ دوای شوێنێكدا ده‌گه‌ڕاین كه‌ بحه‌وێینه‌وه‌، بیرم كردووه‌؛ ( به‌ بڕوای من خۆی ئه‌م داستانه‌ی هه‌ڵبه‌ستووه‌. له‌وانه‌یه‌ داستانێكی نایاب بێت، به‌ڵام بوونی نییه‌. )

"سه‌ن ساوه‌ن" زیاتر له‌ سی ماڵی تێدا بوو، وه‌ به‌ زوویی ناچار بووین كارێك بكه‌ین كه‌ من پێشنیارم كردبوو ـــ بڕۆین بۆ شارێكی گه‌وره‌تر.

هه‌رچه‌نده‌ش كه‌ حه‌یران بوو، هه‌رچه‌نده‌ش كه‌ "كه‌سێكی تری" له‌ ژیانی دوور خستبوه‌وه‌، دانیشتوانی "سه‌ن ساوه‌ن" نه‌یانده‌زانی كه‌ خه‌ونی ئه‌و ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌و شه‌وه‌ له‌وێدا بخه‌وێت، وه‌ هیچ یارمه‌تییه‌كیان نه‌داین. به‌ڵام كاتێك كه‌ چیرۆكی ده‌ووت، وه‌ك بڵێی خۆمم ده‌بینییه‌وه‌ له‌ ناو، ترسه‌كان، نا ئاسایشیه‌كان و مه‌یل نه‌كردن به‌ وورد بوونه‌وه‌ و سه‌رنجدان له‌ هه‌ر شتێكی سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ ئاسا ـــ چونكه‌ له‌وانه‌یه‌ سبه‌ینێ ته‌واو ببێت و ڕه‌نج بكێشین.

وه‌ك بلێی چاره‌نوس ده‌یه‌وێ پیشانی بدات كه داستانه‌كه‌ی "كه‌سێكی تر" ڕاسته ـــ وه ڕۆژگاریش هه‌میشه به سوودی ئه‌وان هاوده‌ست ده‌بێت ـــ خانوویه‌كمان په‌یدا كرد كه ژوورێكی به دوو شوێن خه‌وی جیا و تۆكمه‌ی هه‌بوو. یه‌كه‌مین كارم ڕۆشتن بۆ حه‌مام بوو، جل و به‌رگه‌كانم شۆرد و كراسێكم پۆشی كه تازه كڕیبووم. هه‌ستم به نوێگه‌ری ده‌كرد ـــ وه ئه‌م هه‌سته‌ش ئاسایشێكی تری به من به‌خشی.

پێكه‌نین گرتمی : ( كه ده‌زانێت، له‌وانه‌یه "كه‌سه‌كه‌ی تر" حه‌زی له‌م كراسه نه‌بێت. )

له دوای زه‌رده‌په‌ڕ ( ئێواره ) داوای شوشه‌یه‌ك شه‌رابی له خاوه‌ن ماڵه‌كه كرد ـــ ڕستورانه‌كانیش له وه‌رزی پایز و زستاندا ته‌عتیل بوون ـــ به‌ڵێنی پێدا كه ڕۆژی دوایی له جێیدا شوشه‌یه‌كی بۆ بكڕێته‌وه .

قه‌مصه‌ڵه‌كه‌مان له‌به‌ر كرد و دوو پێكمان به قه‌رز وه‌رگرت و چووینه ده‌ره‌وه.

ووتم : ( با بڕۆین له كه‌ناری چاڵه‌كه‌دا دانیشین. )

دانیشتین و نۆشیمان تا سه‌رما له جه‌سته‌مان دووربخه‌ینه‌وه.

به گاڵته‌وه ووتم : ( ئه‌ڵێی "كه‌سێكی تر" دووباره له ناخی تۆدا تواوه‌ته‌وه. سروشت ته‌نگه. )

پێكه‌نی.

ـــ ( ووتم كه ژوورێك په‌یدا بكه‌ین په‌یدامان كرد. هه‌میشه ڕۆژگار یارمه‌تیمان ده‌دات له جه‌نگدا بین بۆ به‌دیهێنانی خه‌ونه‌كانمان، هه‌رچه‌نده ئه‌گه‌ر كارێكی گێلانه‌ش بێت. چونكه خه‌ونه‌كانی ئێمه بوونیان هه‌یه و ئێمه ده‌زانین ئه‌م خه‌ونانه چ بایه‌خێكیان هه‌یه. )

مانگ كه له ڕووناكی گڵۆپه‌كانی شه‌قامه‌كه‌دا ڕه‌نگی زه‌رد بوو بوو، نه‌یده‌هێشت ئه‌و به‌ری چاڵه‌كه ببینین.

هەناسەیەکی ساترم هەڵکێشا. ئیتر نەدەبوو گفتەکانم دوا بخەم.
درێژەم پێدا: ( سەبارەت بە ئەوین بدوێین. ئیتر ناتوانین بیخەینە پەراوێزەوە. تۆ دەزانی ئەم چەند ڕۆژەم چۆن چۆنی بەسەر بردووە.
ئەگەر بە دەستی من دەبوو ئەم بابەتە نەدەدرکا. بەڵام ئێستا کە درکاوە، ناتوانم بیری لێ نەکەمەوە. )
ـــ ( ئەوین ترسناکە. )
وەڵامم دایەوە: ( دەزانم. پێشتر ئەویندار بووم. ئەوین وەك مادە سڕکەرەکانە. لە سەرەتای هەست و سەرخۆشی و خۆ بەدەسەوەداندا بۆ مرۆڤ دەست دەدات. ڕۆژی دوایی، زیاترت دەوێ. هێشتا موعتاد "مودمین" نیت، بەڵام حەز بەو هەستە ئەکەیت و وا ئەزانیت ئەتوانی خۆت بۆ خۆت هەڵبژێریت. چەند خولەکێك بیر لە ئەویندارەکەت ئەکەیتەوە و دوایی سێ کاتژمێر لەبیری دەکەیت.
بەڵام کەم کەم خوو دەگریت بەو کەسەوە و بە تەواوی پەیوەست دەبیت پێیەوە. ئێستا سێ کاتژمێر بیر لە ئەو دەکەیتەوە و دوو خولەك لە بیری ئەکەیت. ئەگەر لە بەردەستدا نەبێت، هەر ئەو هەستەت هەیە کە موعتادە خومارەکان هەیانە. لەم ساتەدا، هەر بەو جۆرەی کە موعتادەکان دەست ئەدەنە کاری دزی و بۆ بەدەستهێنانی ئەو چیان ئەوێت، جەستە بە خەم و خەفەت ئەسپێرن، تۆش ئامادەیت لە پێناوی ئەویندا دەست لە هەموو کارێك وەربدەیت. )
ووتی: ( چ نمونەیەکی ترسناك بوو ! )
بەڕاستی نمونەیەکی ترسناك بوو هیچ پەیوەندیەکی گونجاوی لەگەڵ هەراب، چاڵ و ماڵەکانی سەدەی ناوەڕاست و دەوروبەری مەیدانە بچوکەکەوە نەبوو. بەڵام نمونەیەك بوو کە ڕاستی هەبوو. ئەگەر لە پێناوی ئەویندا

ئەوەندە هەنگاوی گەورەی هەڵبگرتایە، دەبووایە یاداوەرییەکانی خۆی بناسیایە.

گەشتمە ئەنجام: ( هەر لەم پێناوەدا، تەنها دەبێت هۆگر بین بە ئەوینی کەسێکەوە کە لێمانەوە نزیکە. )

ماوەیەکی زۆر چاوی بڕییووە مانگ و بە سەرسامی مایەوە. بە ڕوواڵەت وا دیار بوو کە ئیتر نەیدەویست لە نێو ئاوی ترسناکدا ووتووێژ سەبارەت بە ئەوینی کەشتیرانی بکەین، بەڵام ڕێگە چارەیەکی ترم نەبوو.

بیرم کردەوە: ( کۆتایی بەسەرهات ! ) سێ ڕۆژ پێکەوە بوون ـــ وە هەموو ڕۆژێك بینینی من هەر بەم جل و بەرگەوە ـــ بەس بوو بۆ ئەوەی بیرو بۆچونی بگۆڕێت، لە خۆبایبوونی ژنانەم کەمێك برینـدار بوو بوو، بەڵام دڵم بە ئەسپایی تر لێیئەدا.

ـــ ( واتە خۆشم هەر ئەمەم ئەوێت ؟ )

چونکە ئیتر هەستم بە ئەو زریانانە دەکرد کە ئەوین لەگەڵ خۆی هێنابوونی.

ئیتر هەستم بە درز نەکرد لە دیواری ( سەدەکەدا ).

ماوەیەکی زۆر نۆشیمان، بێ ئەوەی کە سەبارەت بە بابەتێکی جدی بدوێین. سەبارەت بە خاوەن ماڵەکەمان و کەسایەتی ئەو پیاوە مەزنەی کە ئەم ماڵانەی بنیاد ناوە دەدواین. چەند ئەفسانەیەکی بۆ باسکردم سەبارەت بە کەنیسەیەکی ئەو لای مەیدان ـــ کەنیسەیەك کە ئەمتوانی بە هۆی مانگەوە بە باشی بیبینم.

لەناکاو ووتی: ( ئاگات لە خۆت نییە. )

بەڵێ، خەیاڵم ڕۆشتبوو. خوازیار بووم لەگەڵ کەسێکدا لەوێ بوومایە و وازی لە دڵم بهێنایە تا لە حاڵەتی خۆیدا بمایەتەوە، لەگەڵ کەسێکدا کە ئەمتوانی بەبێ ترس لە دابڕان و جیا بوونەوە لە ڕۆژی دوایی، ئەم ساتە

له‌گه‌ڵ ئه‌و ژیان به‌سه‌ر به‌رم. ئه‌و كاته‌ كات به‌ هێواش تر تێده‌په‌ڕی، ده‌مانتوانی به‌ بێده‌نگی بمێنینه‌وه ــــ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ته‌واوی ته‌مه‌ن كاتمان بۆ وتووێژ كردن ده‌بوو. پێویست نه‌بوو خۆم نیگه‌رانی مه‌سایلی جدی و نیگه‌رانی بڕیارانی جدی و ده‌سته‌واژه‌ بێ ڕه‌حمه‌كان بكه‌م.

بێده‌نگین...... و ئه‌مه‌ش نیشانه‌یه‌كه‌. بۆ یه‌كه‌مین جار بێده‌نگین هه‌رچه‌نده‌ به‌ ته‌نهام، وا بزانم كه‌ ڕۆشتووه‌ تا شوشه‌یه‌كی شه‌رابی تر په‌یدا بكات.

بێده‌نگین. ده‌نگی هه‌نگاوه‌كانی ئه‌و تا لێواری چاڵه‌كه‌ ده‌بیستم. كاتژمێرێكه‌ لێره‌داین، ده‌نۆشین و له‌ مانگ ده‌ڕوانین.

به‌ڕاستی بۆ یه‌كه‌مین جار بێده‌نگین. ئه‌م بێده‌نگی‌یه‌ بێده‌نگی دڵه‌ له‌رزه‌ی ناو ئوتۆمۆبیل نی‌یه‌ له‌ كاتی كۆچ له‌ مه‌دریده‌وه‌ بۆ بیلباو. به‌ڵكو بێده‌نگی‌یه‌كه‌ كه‌ ده‌دوێت. بێده‌نگییه‌ك كه‌ ئه‌ڵێت ئیتر پێویست ناكات هیچ شتێك بۆ هیچ كه‌سێك ڕوون بكه‌ینه‌وه‌.

هه‌نگاوه‌كان نزیك ده‌بنه‌وه‌. سه‌یرم ئه‌كات ــــ حه‌تمه‌ن ئه‌وه‌ی ئه‌یبینێت، جوانه‌:

ژنێكی دانیشتوو له‌ كه‌ناری چاڵێكدا، له‌ مانگه‌ شه‌وێكدا، له‌به‌ر ڕووناكی گلۆپێكی شه‌قامدا.

ماڵه‌كانی سه‌ده‌ی ناوه‌ڕاست و كه‌نیسه‌ی سه‌ده‌ی یازده‌هه‌م و بێده‌نگی.

دووەمین شوشەی شەراب نیوە بووە، کە بڕیاری گفتوگۆ کردن ئەدەین.

ـــــ ( بەیانی دڵنیا بوو بووم کە بوومەتە کەسێکی کحولی. بە درێژایی ئەو ڕۆژانە خواردمەوە. لەم سێ ڕۆژەدا لە تەواوی ساڵێك زیاتر خواردبوومەوە. )

دەستی دەخاتە سەر سەرم، بێ ئەوەی کە شتێك بڵێت. هەست بە دەستی ئەکەم و دەستی لانابەم.

ئەڵێم: ( کەمێك سەبارەت بە ژیانت بۆم بڵێ. )

ـــــ ( باسی شاراوەی زۆری نییە. ڕێگەم هەیە و تەواوی هەوڵی خۆم دەخەمە گەڕ کە بەو شێوەیەی شایستەیەتی، لەو ڕێگەیەدا هەنگاو هەڵبگرم. )

ـــــ ( ڕێگەت چییە؟ )

ـــــ ( ڕێگەی کەسێك کە لە بە دواداچونی ئەویندایە. )

درێژەی پێدەدا: ( ئەوین ڕێگایەکی پێچاوپێچ و ئاڵۆزە. )

دەڵێم: ( چونکە لەم ڕێگایەدا، یان بە ئاسمان دەگەین یان لە دۆزەخدا ڕۆ دەچین. ) دڵنیا نیم مەبەستی من بێت.

هیچ ناڵێت. لەوانەیە هێشتا نووقمی ئۆقیانووسی بێدەنگی بێت، بەڵام شەراب دووبارە زمانی کردمەوە و دەبێ قسە بکەم.

ـــــ ( ووتت شتێك لەم شارەدا ڕێڕەوی ژیانتی گۆڕیوە. )

ـــــ ( وا دەزانم کە وا بێت. هێشتا دڵنیا نیم، هەر لەبەر ئەوە وویستم تۆ بهێنم بۆ ئێرە. )

ـــــ ( تاقیکردنەوەیەکە؟ )

ـــــ ( نەخێر. خۆ بە دەستەوە دانێکە. تا ئەو هاوکاریم بکات باشتر بڕیار بدەم. )

ـــــ ( کێ؟ )

ـــــ ( کچە مریەم. )

کچ. ئەبوایە تێبگەشتمایە. سەرم سوڕ دەما کە لە دوای ئەم هەمووە ساڵە کۆچ، دۆزینەوەی شوێنی نوێ، هێشتا نەیتوانیوە خۆی لە مەزهەبی کاسۆلیکی دەورانی منداڵی ڕزگار بکات.

ــــ (سەیرە کە دوای ئەم هەموو ڕووداوە، هێشتا پاوەرت پاراستووە.)

ــــ (ئەم پاراست، لە دەستم دا و دووبارە بە دەستم هێنایەوە.)

بڕوا بە "مریم" ؟ بە شتانێکی "غیر ممکن" و خەیاڵی؟ ژیانێکی چۆنی کارام نەبوو؟

ــــ (ژیانێکی سروشتی و ئاسایم هەبوو. ئەویندارى کچانێکی زۆر بووم.)

هەست بە ئیرەیی دەکەم و لە پێچەوانەی کرداردا "عکس العمل" سەرسام دەبم. بەڵام وا دێتە بەرچاو ئاگری دەرونم دامرکاوەتەوە و ئامەوێ بەخەبەری بێنم.

ــــ ( بۆچی کچە ؟ بۆچی خانمەکەمان وەکو ژنێکی سادە، وەکو ژنەکانی دیکە پیشانی ئێمەی نادەن؟ )

پاشماوەی شەرابەکە دەخواتەوەو لە من دەپرسێت کە بە دوای شوشەیەکی تردا بڕوات ؟ وەڵامی ئەدەمەوە کە نەخێر نابێت.

ــــ ( شتێك کە ئەمەوێ وەڵامم بدەیتەوە ئەمەیە. هەر ئەوەی کە سەبارەت بە مەسایلێکی تایبەت گفتوگۆ دەکەین، باسەکە بۆ شتێکی تر دەگۆڕی. )

ــــ (مریەم ئافرەتێکی ئاسایی بوو. منداڵی تریشی هەبوو. لە کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە عیسا دوو برای تری هەبووە.

کچێتی مریەم لەکاتی هێنانە کایەی عیساوە بابەتێکی ترە: مریەم دەورانێکی نوێی لە خۆشبەختی دەست پێکرد. لەو ساتە بە دواوە چەند هەنگاوێکی تر دەستی پێکرد. ئەو بوکی ڕۆژگارە، زەوی کە ئامێزی بە ڕووی ئاسماندا والا دەکات، کە ڕێگەی دەدات دووگیان بێت و بەرهەم ببەخشێ.

لەم ساتەدا، بە ئازایەتی و چالاکی خۆی بە ڕازی بوون بە چارەنوس، مۆڵەتی بە خوداوەند دا کە بێتە سەر ڕووی زەوی. و تا خۆی گۆڕا بە گەورەترین. )
دەزانێت. بە تەواوەتی لە ووتەکانی تێناگەم.
ـــ ( مریەم ڕوخساری جنسی مێینـەی خودایـە. ئـەو پایـەی خـودایی خـۆی هەیە. )
بە توڕەییەوە دەدوێ ، هەر وەك بڵێی بە زۆر دەدوێت، وەك بڵێی خەریکە تـاوان دەکات.
دەپرسم: ( یەك خودای خانم؟ )
کەمێك بە چاوەڕوانی دەمێنمەوە تا بە ڕوون تر بۆم شی بکاتەوە، بـەڵام ئـیتر درێژەی بە باسەکەی نەدا. تا چەند خولەکێك لەمەوپێش، بیرم لە تانـەکانی ئەو دەکردەوە کە لە مەزهـەبی کاسـۆلیکی دەدا. وەك ئـەوەی کـە دەسـتەواژە گەلێك لە ناخمدا وەك کوفر خۆیان پیشان بدەن.
منیش دەمەوێ درێژە بە باسەکە بدەم:
ـــ ( کچە مریەم کێیە؟ خودای خانم کێیە؟ )
سات بە سات نائاسوودەتر دەبێت: ( ڕوونکردنەوەکەی دژوارە. لـەم بارەیـەوە شتێکم نوسیوە و لەگەڵ خۆم هێناومە. ئەگەر بتەوێ، دەتوانیت بیخوێنیتەوە. )
جەختی لەسەر ئەکەمەوە: ( ئێستا نامەوێ هیچ شـتێك بخوێنمـەوە. دەمـەوێ بۆمی ڕوون بکەیتەوە. )
شوشەی بادەکە هەڵدەگرێت، بەڵام خاڵیە. ئیتر نایەتەوە بیرمان کە چ شـتێك ئێمەی هێناوە تا لای ئەم چاڵە. ڕووداوێکی گرنگ خەریکە ڕوو دەدات ـــ وەك بڵێی دەستەواژەکانی خەریکن سەیر و سەمەرە بەرپا دەکەن.
جەخت دەکەمەوە: ( درێژەی بەرێ. )

ـــ ( پیشاندانی ئه‌و ئاوه، هه‌ر ئه‌و مانگه‌ی كه له دەورو به‌رمانه. خانمی خودا سوود له ئاو وەردەگرێ بۆ پیشاندانی خۆی. )

وەك بڵێی مانگ گیانی به به‌ردا دێته‌وه و دەگۆڕێت به ڕوونیكی پیرۆزـــــ هه‌رچه‌نده هێشا نازانم مه‌به‌ستی چییه.

ـــ ( نامه‌وێ سه‌باره‌ت به مێژوو بۆت بدوێم، ئه‌گه‌ر ئه‌ته‌وێ له‌م باره‌یه‌وه بزانی، ئه‌توانی ئه‌و كتێبه بخوێنیته‌وه كه نووسیومه، به‌لام ئه‌وه بزانه كه ئه‌م ژنه ـــ خانمی خودا، كچه مریه‌م ، خزمه‌تكار و خانم ـــ له ته‌واوی ئاینه‌كانی جیهاندا. له‌بیر كرا، قه‌دەغه كرا، شێوه‌ی خۆی گۆڕی، به‌لام هه‌زاران هه‌زار زانست و ته‌ریبه‌تی مایه‌وه تا به ئه‌مڕۆ گه‌شت.

یه‌كێك له ڕووخساره‌كانی خوداوەند، ڕووخساری ژنێكه. )

له ڕووخساریم ڕوانی. چاوەكانی بڕیبووه مانگه‌وه. بینیم ئیتر پێویست ناكات جه‌خت بكه‌مه‌وه درێژه‌ی پێبدات.

ـــ ( ئه‌و له یه‌كه‌مین به‌ندی كتێبی مقدس ئاماده‌یه ـــــ كاتێك كه ڕۆحی خودا ئاوه‌كان هه‌ڵده‌كێشێت، و خودا ئه‌ستێره‌كان له ژێر و سه‌ردا داده‌نێت. ئه‌مه زەواجی عیرفانی زەوییه له‌گه‌ڵ ئاسمان.

ئه‌و له كۆتا به‌ندی كتێبی مقه‌ده‌س ئاماده‌یه، كاتێ كه

ڕۆح و عه‌روس ده‌ڵێن: وەره

هه‌ر ئه‌وه‌ی كه ده‌بیستێت بڵێت: وەره

هه‌ر ئه‌وه‌ی كه تینووه، بێت، وه

هه‌ر ئه‌وه‌ی كه ده‌یه‌وێت به بێ به‌رامبه‌ر"به‌لاش" ئاوی ژیان به ده‌ست بێنێ. )

ـــ ( بۆچی دەرخسته‌ی ڕووخساری مێینه‌ی خودا ئاوه؟ )

ـــــ (نازانم. بەڵام بە زۆری سوود لەم ئالەتە وەردەگـرن بـۆ خۆپیـشاندان. لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە سەرچاوەی ژیانە، وە لە ئاوەوە دێینە بـوون، وە نۆ مانگ لە ناو ئاودا ژیان بەسەر ئەبەین.

ئاو پیشاندەری توانای ژنانەیە، هێـز و توانایـەك كـە هـیچ پیاوێـك ـــــ هەرچەندێكیش كە ڕۆشنبیر و تۆكمە بێت ـــــ ناتوانێت بە دەستی بێنێت.)

ساتێك هەڵوێستە دەكات، بەڵام دووباره درێژەی پێدەدا:

ـــــ (لە هەر دینێك، لە هەر سونەتێك، بە شێوازێك خۆی پیشان ئـەدات ـــــ بەڵام هەمیشە دەردەكەوێت. لێرەدا كـە مـن كاسـۆلیكم، ئـەتوانم لـە كـچە مریەمدا ئەو دیاری بكەم.)

دەستم دەگرێت، و بە پێنج خولەك هەنگاونان و پیادە ڕۆیی، لە سـەن سـاوەن دەچینە دەرەوە. لە كەنارى ستونێك لە قـەراغی شـەقامدا تێپـەڕ دەبـین كـە شتێكی سەیری لە سەرەوەیە: خاچێك، وە پەیكەرى كچە مریەم لـە شـوێنێكدا كە ئەبوایە عیسای مەسیح لەوێ بوایە. دەستەواژەكانی دێنمەوە بـیری خـۆم و لەم ڕێكەوتە سەرسام دەبم.

ئێستا تاریکی و مانگ بە تەواوی لە پێشمانەوەن. کەم کەم خۆم لە نێو ئاودا لەبیرمەوە ، لە سکی دایکدا ـــ شوێنێك کە ڕۆژگار و خەفەت تیایـدا بـوونی نییە. وەك ئەوەی ئەو شتانەی کە ئەیلێت، پڕ واتا بێت، واتایەکی ترسناك و سامناك. ئەکەومە یادی ئەو خانمە لە کۆنفرانسەکەدا. ئەکەومە یادی کـچێك کە منی بۆ مەیدان برد. ئەویش ئەیووت ناو پیشاندەری خانمی خودایە.

درێژەی پێدەدا : ( لە بیـست کیلۆمـەترێکی ئێـرەدا ئەشکەوتێك هەیـە. لـە 1858/2/11 ، کچێك لەگەڵ دوو منداڵی تر، لە دەورو بـەری ئەشـکەوتەکە ( کا ) یان کۆدەکردەوە. کچەکە لاواز بوو وە تەنگە نەفەسی هەبوو لە فەقیری و نەهامەتیدا ژیانی بەسەر ئەبرد. لەو ڕۆژە زستانییەدا، دەترسا لەوەی کە لـە جۆگەلەیەکی بچووك بپەڕێتەوە، لەوانە بوو تەڕ ببێت، نـەخۆش کـەوێت، وە دایك و باوکی پێویستیان بە ئەو برە کەمە پارەیە هـەبوو کـە ئـەو بـە هـۆی شوانییەوە بەدەستی ئەهێنا.

لەو کاتەدا، ژنێك بە جل و بەرگی سپییەوە، بە دوو گوڵی ئاڵتونییەوە کە لـە پێکانیدا بوو دەرکەوت. کە بە شێوەی شا ژنێك ڕەفتاری دەکرد، تکـای لێ کـرد کە چەند جارێکی دیاری کراو بگەڕێتەوە بۆ ئێرە، و دیار نەما و لـە چـاو وون بوو. دوو کچی تر کە ئەویان لە دوورەوە بینی بوو، زۆر بە زوویی هەواڵەکەیان بڵاوکردەوە.

لەو کاتە بە دواوە، ئەزمونێکی درێژ بۆ سەلماندنی بێ تاوانییـەکانی دەسـتی پێکرد. زیندانیان کرد و داوایان لێکرد کە هیچ شتێك نـەدرکێنێت و ئینکـاری بکات لەوەی کە بینیوویەتی. بـە پـارە ئازادیـان کـرد تـا داوای میهرەبـانی ئاییەتی لێ بکات. ڕۆژەکانی یەکەم، لە مەیدانی گشتیدا تۆمەتیان دایە پاڵ خانەوادەکەی ـــ ئەیانووت ئـەو هـەموو کارەکـانی کـردووە لەبـەر ئـەوەی سەرنجی خەڵکی ڕاکێشێت.

كچەكە كە ناوى "Bernadette" بوو ـــ هيچ وێنەيەكى نەبوو، لەوەى كە بينى بووى. باوك و دايكى، ئازار دراو، داواى يارمەتيان لە قەشەى مەسيحيەكان كرد. باوكى ڕۆحانى پێشنيارى كرد لە بينينى دووەمدا، بپرسێت ئەو ژنە ناوى چييە.

"Bernadette" پێشنيارى قەشەى مەسيحيەكانى بە ئەنجام گەياند، بەلام وەلامى ئەو تەنها زەردەخەنەيەك بوو. ئەو بە تێكڕا هەژدە جار دەركەوت، و لە زۆربەى كاتەكاندا هيچى نەدەووت. بەلام جارێكيان، داواى لە كچەكە كرد كە ماچى زەوى بكات. "Bernadette" ، هەرچەند نەيدەزانى بۆچى، كارێك كە ئەو داواى لێكردبوو ئەنجاميدا. ڕۆژێكى تر، داواى لە كچەكە كرد لە زەوى ئەشكەوتەكەدا چالێك بكەنێت. "Bernadette" ئەمرەكەى بەجێهێنا، دواى كەمێك ئاوێكى لێل دەركەوت ـــ چونكە بەرازەكان لێرە دەژيان.

خانمەكە ووتى: لەو ئاوە بهەنتاوەوە.

ئاوەكە ئەوەندە پيس بوو كە "Bernadette" ناچار بوو سێ جار ئاوەكە هەلگرێت و ڕۆى بكاتەوە، بەبێ ئەوەى جورئەتى ئەوە بكات ئاوەكە بخواتەوە. بەلام سەرئەنجام بەبێ مەيلى لە ئاوەكەى خواردەوە. لەو شوێنەى كە زەوييەكەى كەند بوو، ئاوێكى زۆر تر هاتە دەرەوە. پياوێكى كوێر چەند دلۆپێك بەر ڕووخسارى كەوتوو بينايى بۆ چاوەكانى گەڕايەوە. ژنێكى بێ هيواو بێ چارە مندالێكى تازە بوويى كە لە باوەشى مەرگدا بوو خستە ناو ئاوەكەوە ـــ ئەوەش لە كاتێكدا كە هەوا لە ژێر سفرەوە بوو. دەردى مندالەكەش سارێژ بوو.

كه‌م كه‌م ئه‌م هه‌واڵه بڵاو بوویه‌وه، و هه‌زاران نه‌فه‌ر پۆل پۆل ده‌هاتن بۆ ئه‌وێ. كچه‌كه هێشتا جه‌ختی له‌سه‌ر ئه‌وه ده‌كرده‌وه كه ناوی ئه‌و خانمه بزانێت، به‌ڵام ئه‌و ته‌نها پێده‌كه‌نی.

تا ئه‌وه‌ی كه ڕۆژێك، خانمه‌كه ڕوو ده‌كاته "Bernadette" و ده‌ڵێت:

ـــ من مریه‌می مقدسم.

كچه‌كه به خۆشحاڵییه‌وه ده‌چێت بۆ لای قه‌شه‌ی مه‌سیحیه‌كان و هه‌واڵه‌كه‌ی پێ ڕاده‌گه‌یه‌نێت.

قه‌شه‌ی مه‌سیحیه‌كان ئه‌ڵێت: ( پێناچێت. كچم، هیچ كه‌س ناتوانێت هاوكات هه‌م دره‌خت بێت و هه‌م میوه. بڕۆ بۆ ئه‌وێ و ناوی مقدس بكه به ڕوویدا.

به بیروبۆچوونی قه‌شه‌ی مه‌سیحیه‌كان ته‌نها خودا ئه‌توانێت له سه‌ره‌تاوه بوونی هه‌بێت ـــ و خودا، به‌گوێره‌ی ته‌واوی به‌ڵگه نامه‌كان، پیاوه. )

هه‌ڵوێسته‌یه‌كی درێژخایه‌نی كرد.

ـــ ( "Bernadette" ناوی مقدسی پێدا پاشی. به‌ڵام مریه‌می مقدس ته‌نها زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كی كرد، هه‌ر ئه‌وه‌نده.

ڕۆژی 1858/6/16 ، ئه‌و خانمه بۆ ئاخرین جار ده‌ركه‌وت. دوای كه‌مێك، "Bernadette" ده‌چێته ناو په‌رستگاوه، بێ ئه‌وه‌ی كه بزانێت بۆ هه‌میشه چاره‌نووس ئه‌و ماڵی دراوسێی ئه‌شكه‌وته‌ی گۆڕیوه. كانیاوه‌كه هه‌ر به‌رده‌وامه، و سه‌یر و سه‌مه‌ره‌كانیش درێژه‌یان هه‌یه.

سه‌ره‌تا داستانه‌كه له فه‌ره‌نسا و دوایی له سه‌رانسه‌ری جیهاندا بڵاوده‌بێته‌وه. تاجره‌كان دێن و ئه‌و شوێنه ئاوه‌دان ئه‌كه‌نه‌وه. چه‌نده‌ها میوانخانه‌ی تێدا بنیاد ده‌نرێت. "Bernadette" ده‌مرێت و دوور له‌م شوێنه دفن ئه‌كرێت، بێ ئه‌وه‌ی كه بزانێت چی ڕوویداوه.

دوای ئەوەی کە لە ڕووداوەکە دڵنیا دەبن، کەسانێك دەست ئەکەن بە تەزوویری سەیر و سەمەرە و کەنیسەکە دەخەنە زەحمەتەوە و دوایی درۆکانیان ئاشکرا دەبن و دەردەکەون. کەنیسەکە بە توندی ڕووبەڕوویان ئەبێتەوە : لە بەروارێکی دیاری کراو بە دواوە، کەنیسەکە تەنها بە ئەو موعجیزانە ڕازی ئەبێت کە لە ئەزمونەکانی پزیشکان و دانایانە.

بەڵام ئاوەکە هێشتا بەردەوامە، وە دەرمانەکانیش درێژەی هەیە. )

ئەڵێی دەنگێك لەم نزیکیانە ئەبیستم. دەترسم، بەڵام ئەو جوڵە ناکات. مانگیش ئیتر ژیان و سەرگوزەشتەی هەیە. بیر لە هەموو ئەو شتانە ئەکەمەوە کە ووتراوە، وە بیر لە پرسیارێك ئەکەمەوە کە وەڵامەکەی نازانم : ئەم شتانە لە کوێ ئەزانی ؟

بیر لە ڕوخساری مێینەی خودا ئەکەمەوە. پیاوێك لە کەنارمدا ڕۆحێکی لێوان لێو لە دژایەتی هەیە. کەمێك لەمەوپێش بۆی نوسیم کە ئەیەوێت بچێتە قوتابخانەی زانستی دینی کاسۆلیك، بەڵام بە بۆچوونی ئەو خوداوەند ڕوخسارێکی مێینەی هەیە.

بێدەنگە. منیش داستانەکەی "Bernadette" لەبەر چاومدا دێت و دەچێت، لە نێوان مانگێکدا کە ئێمەی لە ئامێز گرتبوو.

دوایی، دووبارە دەست دەکاتەوە بە گفتوگۆ کردن :

ـــ ( "Bernadette" دوو شتی گرنگی نەدەزانی. یەکەم ئەوەی کە پێش لە گەشتنی مەسیحیەت بۆ ئێرە، ئەم کێوانە بەردەلانێك بوو ـــ وە پەرستنی خانمی خودا گەورەترین ئاینی ئەم فەرهەنگە بوو. ئەوە گەلێك هەبوون کە ڕوخساری مێینەی خودایان ئەناسی وە لە ئەوین و گەورەیی ئەو شارەزا بوون. )

ـــ ( وە دووەم؟ )

ـــ (دووەم ئەوەی کـە کـەمێك پـێش لـە خـۆ پیـشاندانی ئـەو خانمـە بـە "Bernadetto" ، خاوەن پلە و پایـەکان بـە شـێوەی نهێنـی جەلەسـەیان ئەشکیل ئەدا.

هـیچ کەسـێك نەیـدەزانی لـەو کۆبوونەوەیـەدا چـی ڕوو دەدات ـــــ وە بـە دڵنیاییەوە قەشەی مەسیحیەکانی لادێی "Lourdes" بچوکترین وێنەی ئـەو کۆبوونەوەیەی لەلا نەبوو. شورای گەورەی کەنیسە کاسۆلیك دەیوویست بڕیـار بدات کە ئایا ئەبێت ئەسڵی "لقاح مقدس" بە ڕەسمی بناسێت یا نا.

لەم ئەسڵە سەرئە نجام لە حوکمی ڕەسمی پاپ، وەك خوایەکی ناو ئەبردنی بە ڕەسمی ناسرا. بەڵام بەشێوەیەکی تەواو بۆ خەڵکیان ڕوون ئەکردەوە کە واتـای چییە.)

دەپرسم: (هەموو ئەمانە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟)

ووتی: ( من شاگردی ئەوم. هەرچییەك کە دەیزانم، لە ئەوەوە فێر بـووم.) وە ئەیدەزانی سەرچاوەی هەموو زانیارییەکانی بۆ من ئاشکرا کردووە.

ـــ (تۆ ئەو دەبینی؟)

ـــ (بەڵێ.)

دەگەڕێینەوە بۆ مەیدان و چەند مەترێك لە نێوان خۆمان و کەنیسەدا دەبڕین. چاڵەکە دەبینم، ڕووناکی چرای ڕێگە و شوشەی بـادە و دوو پێکـی خـاڵی لـە لێـواری چـاڵەکەدا. دەکەومـە بیرکردنـەوە: حەتمـەن دوو ئەوینـدار لێـرە دانیشتوون. لە بێدەنگیدا، لە حاڵەتێکدا کە دڵەکانیان گفتوگۆیـان کـردووە. وە دوای ئەوەی کە دڵەکانیان هەموو شتێکیان ووت، ڕاز و نهێنییەکی زۆر گەورە پێکەوە شەریك بوون.)

جارێکی تر گفتوگۆ سەبارەت بە ئەوین بە هیچ شـوێنێك نەگەشـتووە. گـرنگ نییە. هەست دەکەم لە بەرامبەر شتێکی زۆر گرنگدام، و دەبێت لە ئەم هەلە بۆ

تێگەشتن هەرچی دەتوانم، سوود وەربگرم. چەند ساتێك ئەکەومە یادی وانەکانم، Zaragoza ، و پیاوێکی گونجاو بۆ ژیانم پەیدا بکەم ـــ بەڵام ئەمانە زۆر دوور خۆیان پیشان ئەدەن، وەك ئەوەی گێرۆدەی هەمان ئەو سەروەرییانەن کە سەن ساوەنی پڕ کردووە.

دەپرسم: (بۆچی داستانی "Bernadette" بۆ باس کردم؟)

بێ ئەوەی لە چاوانم بڕوانێت، وەڵام دەداتەوە: ( بەتەواوەتی نازانم. لەوانەیە لەبەر ئەوەی کە لە نزیك لادێی "Lourdes" وەین. لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە سبەی جەژنی "لقاح مقدس" ە . لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت کە ئەمەوێت دنیای خۆمت پیشان بدەم، بەو شێوازە دێتە بەرچاو، کە گۆشەگیری و جنون ئامێز نییە.

کەسانێکی تریش لە دنیای مندا هەن. و باوەڕیان بەو شتانە هەیە کە ئەیلێم. )

ـــ ( هیچ کات نەمووتووە دنیای تۆ جنون ئامێزە. لەوانەیە دنیای خۆم بەو شێوەیە بێت: گرنگترین دەورانی ژیانم لە پشت کتێب و دەفتەرەوە بەسەر بردووە، تا نەتوانم لە جێگەیەك کە دەیناسم بچمە دەرەوە.)

هەست ئەکەم ئاسوودە تر دەبێت: دەرکی پێدەکەم.

ئومێدەوار بووم درێژە بە گفتوگۆ کردن بدات سەبارەت بە خودای خانم، بەڵام ڕووی لە من کرد:

ـــ (بڕۆین بخەوین. زۆرمان خواردۆتەوە. )

## سێ شەممە

## 1993/12/7

زوو چووە خەوەوە، ماوەیەکی زۆر بەخەبەر بووم و بیرم لە مانگ، لە مەیـدان، لە بادە و گفتوگۆکان ئەکردەوە، دەست نوسێك کە بە منی دابوو، خوێندمـەوە و هەستم بە شادی کرد، خودا [illegible] بە ڕاستی بوونی هەبووایە ـــ هاوکات هەم باوك بوو هەم دایك.

دوایی چراکەم کوژاندەوە و بیرم لە بێـدەنگی کـەناری چـاڵەکە کـردەوە. لـە هەمان ساتەکانی بێدەنگیدا بوو کە بۆم دەرکەوت چەندە لە ئەوەوە نزیکم.

هیچ یەکێك لە ئێمە هیچی نەووتبوو. گفتوگۆ سەبارەت بـە ئـەوین پێویـست نییە، چونکە ئەوین ئاوازی تایبەتی خۆی هەیە و خۆی دەدوێت. ئەو شەوە، لە لێواری چاڵ، بێدەنگی مۆڵەتی دا دڵەکانمان لێکەوە نزیـك بنـەوە و یـەکتری باشتر بناسن. دوایی دڵی من ووتەکانی دڵی ئەوی بیست و هەسـتی بـە شـادی کرد.

پێش ئەوەی کە چاوەکانم دا بخەم، بڕیارمدا کارێك کە ئەو بە ڕاهێنانێکی تر ناوی دەبات، ئەنجامی بدەم.

بیرم کردەوە: ( لەم ژوورەدام، دوور لە هەموو ئەو شتانەی کە خـووم پێیانـەوە گرتبوو، سەبارەت بە شتانێك بیردەکەمەوە کە تـا ئێـستا بەلامـەوە گـرنگ و سەرنج ڕاکێش نەبوون، وە لە شارێکدا دەخەوم کە هەرگیز پـێم نەخـستووەتە ناوییەوە. دەتوانم چەند خولەکێك وا خۆم پیشان بدەم کە جیاوازیم هەیە. )

ده‌ستم کرد به وێنه کردنی ئه‌وه‌ی که حه‌ز ده‌که‌م له‌و ساته‌دا چۆن بجوڵێمه‌وه.
حه‌زم ئه‌کرد شاد بم، سه‌رحاڵ و خۆشبه‌خت. هه‌موو ساته‌کان به ته‌واوی بوونه‌وه (وجوده‌وه) ژیان به‌سه‌ر به‌رم، به تینویه‌تی ئاوی ژیان بنۆشم. جارێکی تر پشت به خه‌ونه‌کان ببمه‌ستمه‌وه. بتوانم بۆ ئه‌وه‌ی که ئه‌مه‌وێت، بجه‌نگم.

له پیاو پیاوێکدا که حه‌ز ئه‌کات، هۆگری ئه‌وین بم.

به‌ڵێ، ئه‌مه ژنێك بوو که ئه‌مویست وا بم ــــ ژنێك که له‌ناکاودا ده‌رکه‌وت، وه گۆڕا به من.

هه‌ستم کرد ڕۆحم له‌گه‌ڵ ڕووناکی ڕۆحی خودا ــــ یا خوداخانم ــــ که باوه‌ڕم پێی ئه‌بوو، نووقم بووه. وه هه‌ستم کرد که له‌م ساته‌دا، ڕۆحم به‌شه‌کانی تری جه‌سته‌می ته‌رك کردووه، وه له گۆشه‌ی ئه‌و ژووره بچوکه‌دا دانیشتووه.

ڕوانیم به ژنێکدا که تا ئه‌و کاته خۆم بووم، تێکشکێنراو، به ڕواڵه‌ت به توانا. له هه‌موو شتێك ئه‌ترسا، به‌ڵام به خۆی ئه‌ووت ئه‌مه ترس نییه ــــ ئه‌مه زۆرزانی که‌سێکه که واقعیه‌ت ده‌ناسێ. له‌به‌رده‌م په‌نجه‌ره‌یه‌کدا که شادی و تیشکی هه‌تاو لێوه‌ی ده‌چێته ژووره‌وه، دیوار ده‌چنێت تا ڕه‌نگی ڕووکه‌شی مۆبێله دێرینه‌کانی کاڵ نه‌بێته‌وه.

که‌سێکی تری دانیشتووم له سوچی ژووره‌که‌دا بینی ــــ تێکشکێنراو، ماندوو. سه‌رقاڵی مه‌هاره‌ت و به‌ندکردنی شتێك بوو که ئه‌بێت هه‌میشه ئازاد بێت: هه‌سته‌کانی. تێده‌کۆشا به ڕه‌نجی ڕابردوو سه‌باره‌ت به ئه‌وینی داهاتوو بڕیار بدات.

ئه‌وین هه‌میشه تازه‌یه. گرنگ نییه که یه‌کجار، دووجار، ده جار له ژیاندا ئه‌ویندار ببین ــــ هه‌میشه له حاڵه‌تێکدا ئه‌بین که ئه‌یناسین. ئه‌وین ئه‌توانێت ئێمه بۆ به‌هه‌شت یا دۆزه‌خ به‌رێت، به‌ڵام هه‌میشه ئێمه بۆ جێگه‌یه‌ك

لەبات. ئەبێت پێی ڕازی بین، چونکە ئەوین هەتاواکی هەستی ئێمەیە. ئەگەر پشتی تێبکەین و ڕەدی بکەینەوە، لە برسا ئەمرین، لە حاڵەتێکدا کە سەیری چڵەکانی درەختی ژیان ئەکەین، بێ ئەوەی کە بوێرین دەستمان درێژ بکەین و لە میوەکانی بچنین. دەبێت تا هەر شوێنێك کە هەیە، بە دوای ئەویندا بڕۆین، هەتا ئەگەر پڕاو پڕی کاتژمێرەکان، ڕۆژەکان، هەفتەکان، نائومێدی و خەم و خەفەت هەبێت.

چونکە لە ساتەکانی بە دوادا چوونی ئەوین بەڕێ ئەکەوین، ئەویش بە بەدواداچوونی ئێمە ڕادەچڵەکێنێت.

وە ئێمە ڕزگار ئەکات.

کاتێك کەسەکەی تر بەجێی هێشتم، دڵم دەستی کرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ ملدا. ووتی کە ترەك و درزی دیوار، ڕێگەی بە تێپەڕ بوونی ناو داوە، "با" لە هەموو لایەکەوە هەڵی کردووە، ئەو شادە، چونکە دووبارە ووتەکانی ئەبیستم. دڵم ووتی کە ئەویندارم. وە من بە خۆشحاڵی خەوتم، بە بوونی زەردەخەنەیەك بەسەر لێوەوە.

کاتێ بەخەبەر هاتم، پەنجەرەکان کراوە بوون و ئەو سەیری کێوەکانی ئەکرد. چەند خولەکێك بەو شێوەیە مامەوە و هیچم نەووت. ئامادە بووم کە ئەگەر ڕووی وەرگێڕێ، چاوەکانم دا بخەمەوە.

وەك ئەوە زانیبێتی چ بیرۆکەیەکم لە سەردایە، ڕووی وەرگێڕا و سەیری چاوەکانی کردم.

ووتی: (ڕۆژ باش.)

ـــ (ڕۆژ باش. پەنجەرەکان داخە. زۆر ساردە.)

کەسەکەی تر بەبێ ئەوەی پێشتر ئاگادارم بکاتەوە دەرکەوت. هێشتا هەوڵی ئەوەی ئەدا ئاراستەی هەوا بگۆڕێت، کەم و کورپییەکان کەشف بکات، بڵێت "لەخێر" ، بڵێت "ممکن نییە". بەڵام ئەمزانی کە ئیتر درەنگە.

ووتم: ( دەبێ جل و بەرگەکانم بگۆڕم. )

وەڵامی دایەوە: ( لە خوارەوە چاوەڕوانم. )

وە کاتێ بەخەبەر هاتم، کەسەکەی ترم لە بیرم کردە دەرەوە، دووبارە پەنجەرەکانم والا کرد، وە ڕێگەم بە تیشکی هەتاو دا کە بێتە ژوورەوە. هەتاوەتاوێك کە هەموو شتێکی نووقمی خۆی ئەکرد ـــ کێوەکان بە بەفر دا پۆشرا بوون ، زەوی بە گەڵای ووشك و وەریو دا پۆشرا بوو، رووبارێکم نەئەبینی بەڵام دەنگیم ئەبیست.

هەتاوەتاو بەسەر سینەی رووتمەوە بوو، جەستەی رووتمی گەرم ئەکردەوە، وە هەستم بە سەرما نەئەکرد، چونکە گەرمایی منی بۆ خۆی ئەبرد ـــ گەرماییەکی پرشنگدار کە ئەبێتە گڕ، گڕێك کە ئەبێتە ئاگر، ئاگرێك کە ئەبێتە خۆڵەمێش و دیار نامێنێت. ئەمزانی.

وە ئەموویست.

ئەمزانی کە لەو ساتە بە دواوە، بە بەهەشت گەلێك و دۆزەخ گەلێك ئاشنا ئەبم، لەگەڵ شادی و ئازار، لەگەڵ خەون و بێ هیوایی، وە ئیتر ناتوانم هەوا بەتین و تاوەکان لە گۆشەیەکی شاراوەی ڕۆحمدا دەستەمۆ بکەم. ئەمزانی کە لەو ساتە بە دواوە، ئەوین ڕێنیشاندەرمە ـــ هەرچەندە لە منداڵیمدا و لە کاتێکدا کە بۆ یەکەم جار ئەوم بینی، ئامادە بووە. بۆچی کە هەرگیز فەرامۆشم نەکردووە ـــ هەرچەندە خۆم بە تاوانباری جەنگی ئەو ئەزانم. لەو زەمانەدا، ئەوین دژوار بوو، لەگەڵ سنوورەکانیدا، کە نەمئەوویست لێیانەوە تێپەڕم.

"مەيدانى سوريا" م هێنايەوە يادى خۆم. ئەو ساتانەى كە لە ئەوم وويست بە دواى مەداليا وون بووەكەدا بڕوات. ئەمزانى ـــ بەڵێ ئەمزانى كـە ئەيـەوێت چى بە من بڵێت، وە نەمئەويست ببيستم، چونكە ئەو لە هەمان ئەو كوڕانە بوو كـە ڕۆژێكـى جـوان و ڕازاوە، بـە دواى پـارە، و داسـتان ووتـن، يـا بـە دواى خەونەكانيدا ئەڕۆشت. پێوويستم بە ئەوينێك هەبوو.

لەو زەمانەدا شتێكى ئەوتۆم لـە ئـەوين نـەدەزانى. كاتـێ ئـەوم لـە كـاتى كۆنفراسدا بينى، وە بە بانگهێشتەكەى ڕازى بووم، وامدەزانى كە ژنێكى بـاڵغ ئەتوانێت دڵى كچێك كە ئەوەندە بـۆ ديـدار لەگـەڵ شـازادەدا جـەنگى بـوو، دەستەمۆ بكات. دوايى ئەو سەبارەت بە منداڵانى هەميشە ئامادە دەدوا ـــ وە من دووبارە ئاوازى كچێكم بيست كە خۆم بووم، ئاوازى شا كچێ كە لە ئـەوين و جيابوونەوە ئەترسا.

چوار ڕۆژى تەواو هەوڵمدا بە شـێوەيەك خـۆم پيـشان بـدەم كـەئاوازى دڵمـم نەبيستووە، بەڵام سات لە دواى سات بـە توانـاتر ئـەبوو ڕۆحمـى بـێ هيـوا ئەكرد. لە پەناگاترين گۆشەى ڕۆحم، "من" هێشتا بوونى هەبوو وە باوەڕى بە خەونەكان هەبوو. پێش ئەوەى كە ڕۆحم شتێك بڵێت، بە سـوار بـوون لەگـەڵ ئەودا ڕازى بووم، بە كۆچ كردن لەگەڵ ئـەودا ڕازى بـووم، بڕيارمـدا پـێ بـە جەرگى خۆمدا بنێم و دڵ بە دەريا بسپێرم.

وە هەر بۆ ئەمە بوو ـــ لە پێناوى شتێكى كەم كە لە "مـن" مابوويـەوە ـــ ئەوين، دواى گەڕان لە چوارگۆشەى جيهاندا، دووبارە منـى دۆزييـەوە. ئـەوين دووبارە منى دۆزييەوە، هەرچەندە ڕۆحم، لە شەقاميكى ئارام لە Zaragoza ، بەربەسـت و سـەدێكى لەبـەردەم دادوەرييـەكان، و كتێبـى وانەكا نمـدا هەڵبەستبوو.

پەنجەرە و پێنوسەکەمم والآ کرد. هەتاوەتاو ژوورەکەی لە خۆیدا نووقم کرد، وە ئەوین ڕۆحمی لە خۆیدا نووقم کرد.

چەند کاتژمێرێکی دوا بە دوای یەك بێ ئامانج لە نێو بەفردا لە سەر جادە ڕێگەمان بڕی، نانی بەیانیمان لە شوێنێکدا خوارد کە هەرگیز لە ناوەکەی نەگەشتم ـــ بەلآم کانیاوێکی هەبوو، لەو کانیاوەدا، پەیکەری ماری و کۆترێك لێك ئالآ بوون و بوو بوونە یەك گیاندار.

بە بینینی ئەم تابلۆیە ، پێکەنی:

ـــ (ئەمە نیشانەیەکە. نێرینە و مێینە لە قالبێکدا تێکەڵ بە یەك بوون.)

ووتم: (هەرگیز بیرم لەو شتانە نەکردوەتەوە کە دوێنێ بۆت باس کردم. بەلآم شتێکی شیاو و ڕاستە.)

دەستەواژەیەك لە کۆچەکەدا دەستکەوتەکانی دووبارە کردەوە: (خوداوەند ئەوی لە ژن و پیاو دروستکرد. بۆچی کە ئەم وێنەی ئەوە هاوشێوەی ئەو بوو: ژن و پیاو.)

بینیم چاوەکانی درەوشاوەیەکی تریان هەیە. شاد و کامەران بوو و بە هەموو قسەیەکی پوچ و بێ واتا پێدەکەنی. لەگەڵ کەسانێك کە لە ڕێگادا دەمانبینین ـــ گفتوگۆی ئەکرد ـــ کاریگەرانی خۆڵەمێشی پۆش کە بۆ سەر کار دەڕۆشتن، "کێو برە" ڕەنگین پۆشەکان خۆیان ساز ئەکرد بۆ سەرکەوتن بەسەر ساترەکاندا.

مات و بێدەنگ بووم، چونکە فەرەنسا زۆر خراپ بوو، بەلآم ڕۆحم بە بینینی شادی ئەو شاد دەبوو.

شادییەکەی بەو جۆرە بوو کە هەمووان کاتێ لەگەڵی ئەدوان پێدەکەنین. لەوانەیە دڵی شتێکی پێ ووتبێت، وە ئێستا ئەیزانی کە خۆشم ئەوێ ـــ

هەرچەندە هێشتا هەر وەکو دۆستێکی دێرینی دەورانی منداڵی ڕەفتارم لەگـەڵ دەکات.

سەرئەنجام ووتم: (ئەڵێی زۆر خۆشحاڵ تری.)

ـــ (لەبەر ئەوەی هەمیشە خەوم ئەبینی کە لەگەڵ تۆدا لێرمدام، ئـەمبینی کە لێرەدام، لەم کێوانـەدا هـەنگاو هەڵـدەگرم و میـوە زێڕینـەکانی هـەتاو دەچنینەوە.)

(میوە زێڕینەکانی هەتاو.) هۆنراوەیەك کە ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش کەسێك نوسی بووی و ئێستا دووبارەی ئەکردەوە ـــ لە ساتی گونجاودا.

کاتێ کە لەو شوێنە لە لای ئەو کانیاوە سەرسوڕهێنەرە دەگەڕاینەوە، ووتم:

ـــ (بە هۆیەکی ترەوە شادی.)

ـــ (چ هۆیەك؟)

ـــ (ئەزانی کە من خۆشحاڵم. لەبەر خاتری تۆیـە کـە ئـەمڕۆ لێـرەدام، بـە ڕاستی بەسەر کێوەکاندا سەردەکەوم، دوور لە کێوی کتێب و دەفتەر. تۆ خەریکە شاد و کامەرانم ئەکەیت. وە شادی شتێکە کە بە دابەشبوون زیاد دەکات.)

ـــ (ڕاهێنانێکی ترت بە ئەنجام گەیاندووە؟)

ـــ (بەڵێ. لە کوێ ئەمە ئەزانی؟)

ـــ (چونکە تۆش گۆڕاوی. وە لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەمیـشە ئـەم ڕاهێنانـە لـە ڕۆژگاریکی ڕاست و دروستدا فێر ئەبێت.)

ڕۆحم بە درێژایی ئەو ڕۆژە لەگەڵمدا بوو. هـەوڵم ئـەدا دووبـارە لـێم نزیـك بێتەوە. بەڵام هەر جارێ دەنگی لاواز تـر ئـەبوو وە شێوەشـی کـەم کـەم وون ئەبوو. کەوتمە بیری کۆتایی فلیمی خوێن هەتاوەکان، کە جەستەکان ئەبوونە تۆز و خۆڵ.

بە کەناری پایەیەکی تردا تێپەڕین کە پەیکەری مریەم لەسەر خاچێك بوو.

پرسی: ( بیر له چی ئه‌كه‌یته‌وه‌؟ )

ـــــ ( بیر له خوێن هه‌تاوه‌كان ئه‌كه‌مه‌وه. بونه‌وه‌ره شه‌و به‌خه‌به‌ره‌كان له نێو خۆیاندا زیندانن و به‌بێ هیوایی به دوای هاوڕێیه‌كدا ئه‌گه‌ڕێن. به‌لام ناتوانن هۆگری ئه‌وین بن.

هه‌ر له‌به‌ر ئه‌مه‌یه كه ئه‌فسانه ئه‌ڵێت ته‌نها تیر له دڵیاندا ئه‌توانێت ئه‌وانه له‌ناو به‌رێت و بیانكوژێت، له وه‌ها حاڵه‌تێكدا، دڵیان به‌خه‌به‌ر دێته‌وه، هێز و توانای ئه‌وین ئازاد ده‌كه‌ن، وه شه‌ڕیش له ناو ئه‌به‌ن. )

ـــــ ( پێشتر هه‌رگیز بیرم له‌م بابه‌ته نه‌كردبۆوه. به‌لام شیاو و ڕاسته‌قینه‌یه. )

توانی بووم ئه‌م تیرانه له خۆم به دووربخه‌مه‌وه. دڵ له نه‌فره‌ت ڕزگاری بوو بوو، دووباره هه‌موو شتێكم گرتبووه‌وه ده‌ست. كه‌سه‌كه‌ی تر ئیتر شوێنێكی بۆ مانه‌وه نه‌مابوو.

هه‌زار جار ئاره‌زووم ئه‌كرد ده‌ستی بگرم، وه هه‌زار جار ئارامم گرت و هیچ كارێكم نه‌كرد. كه‌مێك گێژ بووم ـــــ ده‌مویست بڵێم خۆشم ئه‌وێ، به‌لام نه‌مده‌زانی له كوێوه ده‌ست پێبكه‌م.

سه‌باره‌ت به كێوه‌كان و ڕووباره‌كان قسه‌مان ئه‌كرد. نزیكه‌ی كاتژمێرێك له جه‌نگه‌ڵ و دارستاندا وون بوو بووین، به‌لام ڕێگه‌ی خۆمانمان دۆزییه‌وه. له‌فه‌مان خوارد و به‌فری تواوه‌مان نۆشی. كاتێ هه‌تاو ئاوا بوو، بڕیارماندا بگه‌ڕێینه‌وه بۆ سه‌ن ساوه‌ن.

دەنگى پێ كانمان لە ديوارى بەردينددا دەنگى ئەدايەوە. بە شێوەى غەريزەيى دەستم خستە ناو ئاوى موقدەسەوە و وێنەى خاچێكم كێشا. ئەوەى كە وتبووى، هاتەوە يادم ـــ ئاو پيشاندەرى خواى ئافرەتە.

وتى: (بڕۆين بۆ ئەوێ.)

لە كەنيسەيەكى چۆڵ و تاريك هەنگاومان دەنا، شوێنێك كە قەديسێك ـــ ساوەن قەديس، لە خوا ترسێك كە لە ئەشكەوتى هەزارەى دووەم دەژيا ـــ لە ژێرى ميحرابى سەرەكيدا دفن كرا بوو. ديوارەكان تا ئێستا چەند جارێك داڕوخا بوون و سەر لە نوێ دروستكرابوونەوە.

هەندێ لە شوێنەكان بەم شێوەيە بوون ـــ لەوانە بوو بەهۆى جەنگەوە وێران كرا بن. بەڵام مقەدەس دەمێنێتەوە. دوايى كەسێك بەو شوێنەدا تێپەڕ ئەبێت، هەست ئەكات شتێك ناتەواوە، و سەر لەنوێ بنيادى دەنێتەوە.

هاوشێوەى عيساى لە دار دراوم بينى كە هەستێكى غەريبى "نامۆيى" بە من بەخشى ـــ بە تەواوەتى هەستم ئەكرد كە سەرى ئەجوڵێت، لەگەڵ مندا دێت.

ـــ (لێرەدا دەمێنينەوە.)

ـــ (سەيرى پەيكەرەكە بكە.)

مريەم لەگەڵ كوڕەكەى لە ئامێزيدا. عيساى بچووك ئيشارەتى بۆ سەرەوە ئەكرد.

ئەوەى كە ئەمبينى پێم ئەووت.

جەختى كردەوە: (بە ووردتر سەرنج بدە و سەيركە.)

هەوڵمدا تەواوى بەشەكانى ئەو پەيكەرە دارينە ببينم: ڕەنگە ئاڵتونيەكەى، پايەكانى، ووردەكارى و دەست ڕەنگينى هونەرمەند لە دروستكردنى چرچ و لۆچى چادرەكەيدا. بەڵام تەنها كاتێك لە پەنجەى عيساى بچووك وورد بوومەوە، تێگەيشتم مەبەستى چييە.

لە ڕاستیدا، هەر چەندە مریەم ئەوی لە ئامێز گرتبوو، بەلام عیسا بوو کە ئەوی ڕاگیر کردبوو. وەك ئەوەی بازوی منداڵەکە ڕوو بە ئاسمان ڕۆشتبێتە سەرەوە، کچە مەریمی تا عەرشی سەرەوە ئەبرد. جارێکی تر ئەوی بۆ بینینی مێردەکەی ئەبرد.

ووتی: (هونەرمەندێك کە شەش سەد ساڵ لەمەوپێش ئەم پەیکەرەی دروست کردووە، زانیویەتی چ کارێك ئەکات.)

دەنگی پێ لە سەر زەوی دارینی کەنیسەکە بەرز بوویەوە. ئافرەتێك هاتە ژوورەوە و مۆمێکی لە بەردەم میحرابی سەرەکیدا داگیرساند.

ماوەیەك لەبەر ڕێزی ئەو عیبادەتە بە بێدەنگیماینەوە.

کاتێ ئەوم بینی نووقمی تەماشای کچە مریەم بووە، بیرم کردەوە: (ئەوین هەرگیز بە تەدریج نایەت.) دوێنێ جیهان بەبێ ئامادەیی ئەو واتا دار بوو. ئێستا ئەو ئەبێت لە پەنامدا بێت تا بتوانم درەوشانەوەی حەقیقەتی هەموو شتێك ببینم.

کاتێ ئافرەتەکە ڕۆشت، ئەو دووبارە هاتەوە گۆ:

ـــ (ئەم هونەرمەندە، خودای ئافرەت و ڕوخساری مێینەی خودای ناسیوە. پرسیارێکت لە من کردووە کە هێشتا نەمتوانیوە وەڵامی بدەمەوە.

پرسیارت کرد: (هەموو ئەم شتانە لە کوێوە فێر بووی؟)

بەڵێ، پرسیبووم و ئەو پێش لەمە وەڵامی دابوومەوە. بەلام بە بێدەنگی مامەوە.

درێژەی پێدا: (وەکو ئەم هونەرمەندە فێر بووم. بە ئەوینی سەرەوەتر ڕازی بووم. مۆڵەتم پێدا ڕێنمونیم بکات و هیدایەتم بدات.

حه‌تمه‌ن ئه‌و نامه‌یه‌ت له‌ بیره‌ كه‌ تیایدا نووسی بووم ئه‌مه‌وێت بچمه‌ نێو قوتابخانه‌ی زانستی ئاینییه‌وه‌. هیچ كات بۆم باس نه‌كردی، به‌ڵام ڕاستیه‌كه‌ی ئه‌مه‌یه‌ كه‌ سه‌رئه‌نجام چوومه‌ ناو په‌رستگاوه‌.)

له‌ناكاو گفتوگۆی پێش كۆنفرانسه‌كه‌م به‌ بیر خۆم هێنایه‌وه‌. توندی لێدانه‌كانی دڵم ڕوویان له‌ زیاد بوون ئه‌كرد، وه‌ هه‌وڵم دا چاو ببڕمه‌ كچه‌ مریه‌م. پێكه‌نی.

بیرم كردەوە: (له‌وانه‌ نییه‌. هاتووه‌تبێته‌ ژووره‌وه‌، و دوایی ڕۆشتووه‌تبێته‌ ده‌ره‌وه‌. تكات لێ ئه‌كه‌م بڵێ كه‌ قوتابخانه‌ت ته‌رك كردووه‌.)

ئه‌م جاره‌، ئه‌بێ ئه‌وه‌ی كه‌ بتوانێت پەی به‌ ئه‌ندێشه‌كانم به‌رێت، درێژه‌ی پێدا: (لاوێتیم به‌ شه‌ڕ و شۆڕێكی زۆر به‌سه‌ر برد، خه‌ڵكی و سه‌ر زه‌وییه‌كانی ترم بینیوه‌. له‌ چوارگۆشه‌ی جیهاندا به‌ دوای خودادا گه‌ڕاوم. به‌ر له‌ ئێستا ئه‌ویندارى ئافره‌تانی تر بووم، وه‌ له‌ ئیداره‌ جۆر به‌ جۆره‌كاندا بۆ كه‌سانی تر كارم كردووه‌.)

برینی چه‌قۆیه‌كی تر. به‌ خۆمم ووت: (ئه‌بێ به‌ ئاگا بم "كه‌سه‌كه‌ی تر" نه‌گه‌ڕێته‌وه‌.) به‌رده‌وام چاوه‌كانم بڕیبووه‌ زه‌رده‌خه‌نه‌ی كچه‌ مریه‌م.

ـــ (ڕازو نهێنی ژیان شێتی ئه‌كردم، وه‌ ئه‌مه‌ویست ئه‌وانه‌ باشتر بزانم. كاتێ به‌ منی ئه‌ووت هه‌موو كه‌سێك له‌ شوێنێكدا شتێك ئه‌زانێ، به‌ دوای وه‌ڵامه‌كانمدا بۆ لای ئه‌و ئه‌ڕۆشتم. له‌ میصر و هندستاندا بووم. له‌گه‌ڵ مامۆستاكانی جادوگه‌ر و چاودێری كردن ئاشنا بووم. له‌گه‌ڵ كیمیاگه‌ران و ڕاحانییه‌كاندا ژیاوم.)

وه‌ له‌ شتێك كه‌ ئه‌مه‌ویست، تێگه‌شتم: كه‌ حه‌قیقه‌ت له‌ هه‌مان ئه‌و شوێنه‌دایه‌ كه‌ ئیمان هه‌یه‌.

حەفتەت لە هەمان ئەو شوێنەدایە کە ئیمان هەیە. جارێکی تـر ڕوانـیم بـە کەنیسەکەدا ـــ بەردە سواوەکان و ڕزیوەکان، کە چەندەها جار داڕوخا بوون و دروستکر بوونەوە. چ شتێك ئەم توانا و بەردەوامییە‌ بە مرۆڤ ئەبەخشێت؟ کـە ئەوەندە بۆ چاکسازی ئەو پەرستگایە بچووکە هەوڵ بـدات ـــ لـەو شـوێنە دوورەوە، لە ناو کێوە زۆر بەرزەکاندا ؟

ئیمان.

ـــ ( بودابییەکان مافی خۆیان بوو، هندۆکان مافی خۆیـان بـوو، هندییـەکان مافی خۆیان بوو، موسوڵمانەکان مافی خۆیان بوو، یەهودیەکان مافی خۆیـان بوو. هەرکاتێ مرۆڤ ڕاستگۆیانە بە دوای ئیمانـدا بـڕوات، ئـەتوانێت بگاتـە خودا و سەیر و سەمەرە بکات.

بـەلام کـات بەسـەر بـردن بـۆ زانینـی ئەمـە بـەس نـەبوو: پێویـست بـوو هەڵبژاردنێك ئەنجام بـدەم. کەنیـسەی کاسـۆلیکم هەڵبـژارد، چـونکە لـەم مەزهەبەدا هاتبوومە دنیاوە و منداڵیم لێوان لێو بوو لە نهێنییەکانی. ئەگـەر بە یەهودییەت ئەهاتمە دنیاوە دینی یەهودیەتم هەڵئەبژارد. خودا هەر ئـەو خودایەیـە، هەرچـەندە هـەزار نـاوی هەیـە، بـەلام ئـەبێت مـرۆڤ ناوێـك هەڵبژێرێت کە خودا بەو ناوەوە بانگ بکات. )

جارێکی تر دەنگی هەنگاوم لە کەنیسەکەدا بیست.

پیاوێك نزیك بوویەوە و بە ڕووی ئێمەدا سەرسام بوو. دوایی لە چەقی میحراب نزیك بوویەوە و دوو مۆمی دەرهێنا. حەتمەن لە بەرپرسانی کەنیسە بوو.

کەوتمە بیری پاسەوانی ئەو کەنیسەیەی پێشوو کـە نەیهێـشت ئێمـە بـچینە ژوورەوە. بەلام ئەمجارە، پیاوەکە هیچی نەووت.

هەر ئەوەندەی کە پیاوەکە ڕۆشت، ئەو ووتی: ( ئەمشەو سەردان کردنم هەیە. )

ـــ ( تکا ئەکەم درێژە بە گفتوگۆکانت بدە، بابەتەکە بگۆڕە. )

ـــ ( هەر لەم نزيکانەدا چوومە نـاو پەرسـتگايەکەوە. چـوار سـاڵی تـەواو، هەرچییەك توانیم خوێندمەوە.
لەم دەورانەدا، لەگەڵ ڕۆشنبیران و خاوەن ویژدانەکان لە پەیوەندیـدا بـووم، ڕووداوە جۆر بەجۆرەکان ماوەیەکە لە هەوڵی ئەوەدان دەرگـا داخراوەکـان واڵا بکەن. بیرم کردەوە کە خودا ئەو دروستکراوە گومڕاکەرە نییە کـە لـە دەورانـی منداڵیدا منی ئەترساند. جموجوڵ بۆ گەڕانەوەی دەورانی بێگەردی دەسـتپێکی مەسیحیەت دەستی پێکردبوو. )
بە تانەوە ووتم: ( دوایی هەزار ساڵ، گەشتنە ئەو ڕایـەی کـە دەبێت مۆڵـەت بدەن کە ئەبێت "عیسا"ش لە کەنیسەدا ڕۆڵێکی هەبێت. )
ـــ ( لەوانەیە بە گاڵتەوە ئەمەت ووتبێت، بەڵام بە دڵنیاییـەوە هـەر وایـە. کەم کەم دەستم کرد بە فێر بوون لە لای یەکێك کە زانایی لـە سـەرو خۆمـەوە بوو. فێری کردم کە ئەبێت ڕازی بم بە ئاگری کەشفی روح القدس. )
کاتێ کە دەستەواژەکانیم بیست، دڵـم پەسـتێنراو تـر ئـەبوو. کـچە مریـەم بەردەوام زەردەخەنەی ئەکرد، و عیسای منداڵ ڕوخسارێکی شاد ئامێزی هەبوو. منیش ڕۆژگارێك باوەڕم بەم مەسەلەیە هەبوو ـــ بەڵام ڕۆژگار، تەمەن و ساڵ و هەستی ئەمەی کـە کەسـێکی مـەنتقی و کاریگـەرم، بـوو بـە هـۆی ئـەوەی مەزهەبەکەم بخەمە ئەو لاوە. بیرم کردەوە چەندە ئارەزوو دەکات ئەو ئیمـانی منداڵییەم بەدەست بێنمەوە، کە ئەو هەموو ساڵە لەگەڵمدا بـوو وە بـوو بـووە هۆی ئەوەی باوەڕ بە بوونی فریشتەکان و سـەیر و سـەمەرەکان بکـەم. بـەڵام گەڕاندنەوەی ئەو ئیمانە تەنها بە بوونی ئیرادە زۆر دژوار بوو.
درێژەی پێدا: ( ئەو کەسەی کە زانایی لە سەرو منەوە بوو بە منی ووت، ئەگەر خۆم ئیمانم هەبێت دەزانم، ئەو کاتـە ئەمـەوێ بـزانم . لـە حوجرەکەمـدا لەگەڵ خۆمدا قسەم ئەکرد. لە بارەگای ڕوح القدوس دەپاڕامەوە کە دەرکەوێت

و هەرچييەك كە ئەمەويێت بيزانم، و فێرم بكات. كەم كەم تێگەشتم كاتێ لـە تەنيايدا قسە ئەكەم، ئاوازێكى هۆشمەندتر لە باتى من قسە ئەكات.)

قسەكانم پێ بڕى: (بۆ منيش هەر بەو شێوەيە بووە.)

چاوەڕوان بووم درێژەى پێبدات. بەلام ئيتر نەمتوانى شتێك بلێم.

ووتى: (خەريكم گوێ دەگرم.)

شتێك زمانمى بەستبويەوە. ئەو قسە گەليكى زۆرى ئەكرد، مـن نەمـدەتوانى هەر بەو دەستەواژانە بۆچوونى خۆم بلێم.

وەك بلێى بيرۆكەكانمى خوێندبێتـەوە، ووتــى: (كەســەكەى تــر ئەيــەوێت بگەڕێتەوە. كەسەكەى تر لە ووتنى قسەى هەلەج و بەلەج دەترسێت.)

وەلامم دايەوە: (بەلێ.) تەواوى هەولەكانم خستەگەڕ كە بەسەر ترسەكانمدا زال بم: (زۆر شت دێتە پێش كە كاتــێ لەگــەل كەسـێكدا دەدوێـم و ئاوێتــەى بابەتەكەى ئەبم، سەرئە نجام قسانێك ئەكــەم كــە خۆشــم پێـشتر بــيرم لێ نەكردوونەتەوە. وەك ئەوەى كە ئەو هۆشە هى من نەبێت، ئەو هۆشە دەخەمــە نێو چالەوە، كە زۆر لە من زياتر بزانێت.

بەلام زۆر بە كەمى ڕێگە ئەدەم ئەم ڕووداوە ڕوو بدات. وەك پيشەى هەميشەيى لە هەموو گفتوگۆيەكدا زياتر هەول ئەدەم گوێ بگرم. وادەزانم خەريكم شتێكى تازە فێر ئەبم، هەرچەندە لە كۆتايدا هەموو گفتەكان لە بير ئەكەم.)

ووتى: (ئێمە گەورەترين سەرسـوڕهێنەرى خۆمـانين. ئەگــەر بەقــەدەر دانــە چەوێك ئيمانمان هەبێت، دەتوانين ئەو كێوە جێگۆڕكێ بكەين. هەر ئەمە فێــر بووم. وە ئەمڕۆ كاتێ لێوان لێو لە ڕێز، گوێ بۆ دەستەواژەكانى خـۆم دەگــرم، سەرسام ئەبم.

هاوەلانى مسيح "حەواريان"، ماسى گر بــوون، نەخوێنــدەوار و نــەزان بــوون. بەلام تيشكێك كە لە ئاسمانەوە هاتبوو، پێى ڕازى بوون.

له نەزانی خۆیان خەجاڵەتیان نەدەکێشا : بڕوایان به ڕۆح القدس هەبوو.
ئەم خەلاتە هی کەسێکە کە پێی ڕازی بێت. تەنها ئەوەنده بەسە کە ڕازی بێت، ڕازی بێت، و له هەڵه کردن نەترسێت. )
کچه مریم له ڕووبەڕوومدا زەردەخەنەی ئەکرد. هۆیەکی تەواوی بۆ گریان هەبوو، بەلام زەردەخەنەی ئەکرد.
ووتم : ( درێژه به گفتەکانت بده. )
وەلامی دایەوە: ( هەر ئەمەیە. ڕازی بوون بە خەلات. وه لە دوایدا خەلات ئاشکرا ئەبێت و دەرئەکەوێت. )
ـــ ( هەر بەم شێوەیه ئەنجامی نییه. )
ـــ ( له مەبەستم تێناگەیت؟ )
ـــ ( تێدەگەم. بەلام من وەکو هەموو مرۆڤەکانی تر: دەترسم. وادەزانم ئەم ڕەوشه بۆ تۆ کار ئەکات، نەك بۆ من. )
ـــ ( یەك ڕۆژ گۆڕانی بەسەردا دێت. کاتێ که تێبگەیت ئێمه هەر وەکو ئەو منداڵەین که ڕووبەڕوومانە و سەیرمان ئەکات. )
ـــ( بەلام تا ئەو کاتە هەمووماندا بیر ئەکەینەوه که له ڕووناکییەوه نزیکین، و ناتوانین گڕی خۆمان داگرسێنین. )
وەلامێکی نەدایەوە.
پاش ماوەیەك ووتم : ( داستانی پەرستگاکەت تەواو نەکرد. )
ـــ ( هێشتاش هەر له پەرستگادام. )
وه پێش ئەوەی که بتوانم "رد الفعل" پیشان بدەم، هەستا و بۆ ناوەڕاستی کەنیسەکه ڕۆشت.

لە شوێنی خۆم نەجولام. سەرم گێژ نەبوو، نەمدەزانی چ ڕووداوێك خەریکە ڕوو نەدات. لە پەرستگادا !

باشتر وا بوو بیر نەکەمەوە. سەدەکە تێکشکا بوو، ئەوین ڕۆحمی نووقم کردبوو، وە ئیتر نەمدەتوانی دەستەمۆی بکەم. هێشتا ڕێگەی هەڵهاتنم هەبوو، کەسەکەی تر ـــ زۆر بێزار بوو، چونکە لاواز بوو، زۆر سارد و سڕ بوو، چونکە نەترسا ـــ بەڵام ئیتر نەمئەویست. ئیتر نەمدەتوانی لە نیگای ئەوەوە دنیا ببینم.

دەنگێك بیرۆکەکانی پێ بڕیم. دەنگێکی درێژخایەن و نەبڕاوە، وەك ئەوەی فلوتێکی گەورەی هێنابێتە دەنگ. دڵم کەوتە جۆش و خرۆش.

دەنگ دیسان هات. دیسان. سەیری پشتی سەرم کرد: پلەکانەیەکی دارین بوو کە بە سەکۆیەکەوە پەیوەند بوو کە هیچ گونجانێکی لەگەڵ هاوئاهەنگی و جوانی درەوشاوەیی بەردەکان نەبوو. لەسەر سەکۆکە، ئۆرگێکی دێرین ئەبینرا. وە ئەویش لەوێ بوو. ڕوخساریم نەئەبینی، چونکە تاریك بوو ـــ بەڵام ئەمزانی لەوێدایە.

هەستامەوە. وە ئەو ڕێگری کردم.

بە ئاوازێکی لێوان لێو لە هەست ووتی: ( پیلار! هەر لەو شوێنەی کە هەیت بمێنەرەوە. )

فەرمایشتەکەیم بە جێهێنا.

ـــ (با دایە گەورە ئیلهامم پێ ببەخشێت، کە ئەمڕۆ، ئەم مۆسیقایە نزا و پاڕانەوەی من بێت. )

وه ده‌ستی كرد به لێدانی ئاوازی ماریا. حه‌ته‌مه‌ن كاتژمێر شه‌شی دوای نیوه‌ڕۆ بوو، كاتژمێری ئه‌نجلەس Angelus * ، له كاتێدا كه ڕووناكی و تاریكی پێكه‌وه گرێ درابون ( ده‌مه‌و ئێواره ).

*Angelus : له ئاینی كاسۆلیكدا، دۆعایه‌كه كه هه‌موو ڕۆژێك كاتژمێر شه‌شی به‌یانی و شه‌شی دوای نیوه‌ڕوان، بۆ له دایك بوونی مه‌سیح ده‌خوێنرێت.

ئاوازی ئۆرگ له كه‌نیسه‌ی چۆڵ ده‌نگه ده‌نگێكی به‌رپا كرد، تێكه‌ڵ به به‌رد و په‌یكه‌ره‌كانی لێوان لێو له مێژوو و ئیمان ئه‌بوو. چاوه‌كانم داخست و ڕێگه‌مدا كه مۆسیقا تێكه‌ڵ به منیش بێت، ڕۆحم له ترس و تاوانه‌كان پاك بكاته‌وه، كارێك بكات كه هه‌میشه له بیرم بێت باشترم له‌وه‌ی كه بیری لێ ئه‌كه‌مه‌وه، به‌هێزترم له‌وه‌ی كه گومان ئه‌به‌م.

به ئاره‌زوویه‌كی گه‌وره‌وه خووم به نزاو پاڕانه‌وه‌وه گرت، وه له‌و كاته‌وه‌ی كه ئیمانم له‌ده‌ستداوه، یه‌كه‌مین جار بوو كه وه‌ها شتێك ڕوویدات.

هه‌رچه‌نده له‌سه‌ر پارچه فه‌رشێك دانیشتبووم، به‌ڵام ڕۆحم له‌به‌ر ده‌م خانمێك كه له به‌رده‌ممدا چۆكی دادابوو. له‌به‌رده‌م ئافره‌تێك كه ووتی:

( به‌ڵێ. )

هه‌رچه‌نده ئه‌یتوانی بڵێت نه‌خێر، وه فریشته به دوای كه‌سێكی تردا ئه‌ڕۆشت و ئه‌مه‌ش به بۆچونی خودا تاوان ئه‌بوو، بۆچی كه خودا لاوازی منداڵه‌كانی به باشی ئه‌بینێت.

به‌ڵام ئه‌و ووتی:

( ویستی تۆ به ئه نجام ڕازیه. )

هه‌تا كاتێك كه هه‌ستی كرد له‌گه‌ڵ ده‌سته‌واژه‌كانی فریشته، ڕازی ئه‌بێت به ته‌واوی ئازار و ڕه‌نجی سه‌رنوشتی، وه چاوی دڵی توانی كوره خۆشه‌ویسته‌كه‌ی

ببينێت كە لە ماڵ چووبوويە دەرەوە، وە خـەڵكى ڕۆشـتن بـە دوايـدا و دوايـى ئينكاريان لێكرد ، بەلاّم

( وويستى تۆ بە ئە نجام ڕازيە . )

هەتـا لە كاتى منداڵ بووندا، پيرۆزترين ساتەكانى ژيانى هـەر ئافرەتێـك، ناچار بوو لە گەورێكدا لە پەناى ئاژەڵەكاندا بخەوێت، بۆچى نووسەرەكە واى ئەووت،

( وويستى تۆ بە ئە نجام ڕازيە . )

هەتـا لە كاتى نارەحەتى و ئـازاردا، لـە شـەقامەكاندا بـە دواى كوڕەكەيـدا دەگەڕا و لە ناو پەرسـتگا بينييـەوە. وە كوڕەكـەى داواى لێكـرد كـە بێـزارى نەكات، لەبەر ئەوەى كە ئەرك و لێپرسراوييەتى ترى هەيە،

( وويستى تۆ بە ئە نجام ڕازيە . )

هەتـا بە زانينى ئەمەش كە تەواوى ژيانى، بە دڵێكى لێـوان لێـو لـە ئـازار، كوڕەكەى جێيەجێ ئەكرد، هەميشە لەوە ئەترسا كـە هـەموو سـاتێك ژيـانى كوڕەكەى بكەوێتە مەترسيەوە، بە بە ئاگا بوون لەوەى كە لـە ژێـر چـاودێرى تەهديد كردندايە،

( وويستى تۆ بە ئە نجام ڕازيە . )

هەتـا كاتێك كە ئەوى لە ناو كۆمەڵێكـدا بينييـەوە و نـەيتوانى لێـى نزيـك بێتەوە،

( وويستى تۆ بە ئە نجام ڕازيە . )

هەتـا كاتێك كە داواى لە كەسێك كرد كە بە كوڕەكەى بڵێت كـە ئـەو لێرەيـە، كوڕەكەى هەواڵى نارد كـە : ( دايـك و براكـانى مـن هـەر ئەوانـەن كـە لـەم پەرستگايەدان )،

( وويستى تۆ بە ئە نجام ڕازيە . )

هەتا کاتێك کە هەموویان سەرئە نجام ڕۆشتن و تەنها ئەو و ئافرەتێکی تــر و یەکێك لە حەوارییەکان لە لای خاچەکە مابوونەوە، وە کۆڵ و بـاری پێکەنینی دوژمنان و ترسنۆکی دۆستەکانیان بە کۆڵ ئەکێشا،

(وویستی تۆ بە ئە نجام ڕازیە.)

خودایە، وویستی تۆ بە ئە نجام ڕازیە. چونکە تۆ لاوازی دڵی دروستکراوەکانت دەزانی، وە لە سەر شانی هەر تـاکە کەسێك کۆڵ و بـارێك دائەنێیت کە توانــای هەڵگرتنی هەبێت. پەی بە ئەوینی من بەرە ـــ چونکە ئەو تەنها شتێکە کــە بەڕاستی هی منە، تـەنها شتێك کە ئەتوانم لەگەڵ خۆمـدا بیبەمـە ژیـانێکی ترەوە. کارێك بکە کە شەهامەت و پاکی خۆی بپارێزێت، بتوانێت لــەو چــاڵ و چۆڵی و داوانەی ژیان خۆی بپارێزێت.

لۆرگەکە بێدەنگ بوو، وە هەتـاو لە پشتی کێوەکانەوە داکەوت ـــ وەك ئەوەی کە هەردووکیان بــە یــەك دەســت هیدایــەت درا بــن. چــاوەکانم کــردەوە، وە کەنیسەکە بە تەواوەتی تـاریك بوو ـــ جگە لەو مۆمە داگیرساوە کە پەیکەری کچە مریەمی ڕونـاك ئەکردەوە.

ئەو لە منی ئەڕوانی، وە منیش لە ئەوم ئەڕوانی. دەستم بۆ دەستی درێژ دەبوو، وە ئەوی بە دەستهێنـا. هەستم کرد ئێستا دڵی ئەوە کە بە توندتر لێئەدات ـــ خەریك بوو ئەمتوانی دەنگی ببیستم، چونکە دووبـارە لە بێدەنگیدا بووین.

بەڵام ڕۆحی من ئـارام بوو، وە دڵم لە ئـاشتیدا بوو.

دەستیم گرت، وە بۆ ئـامێزی ڕایکێشـام. نـازانم چەندێك بەو شـێوەیە لــە ژێــر پێی کچە مریەمدا ماینەوە، چونکە کـاتیش ڕاوەستـابوو.

کچە مریەم لە نێمەی نەڕوانی. کچێکی لاوی لادێیی کە بەڵێ ی بۆ چارەنووسی خۆی کردبوو، نەیتوانی تێبگات، لەوەی کە ژنێک کوڕی خودای لە ئامێز گرتووە، و ڕازی بووە بە ئەوینی خوای ئافرەت لە دڵی خۆیدا.

نەمئەویست پرسیار سەبارەت بە هیچ شتێک بکەم. ئەو ساتانەی کە لە کەنیسە بەسەرچوو لەو زەردەپەڕەدا، بەس بوو بۆ تێگەشتن لە تەواوی ئەو کۆچە. ئەو چوار ڕۆژە لەگەڵ ئەودا بوون، بەس بوو بۆ تێگەیشتن لەو ساڵە، ساڵێک کە هیچ ڕووداوێکی گرنگ تیایدا ڕووی نەدابوو.

هەر لەبەر ئەوە نەمئەویست پرسیار سەبارەت بە هیچ شتێک بکەم. دەست لە ناو دەستی یەک لە کەنیسە چووینە دەرەوە و گەڕاینەوە بۆ ژوورەوە. سەرم گێژ ئەبوو ـــ قوتابخانەی زانستی ئاینی، دایە گەورە، سەردانێک کە ئەو ئەو شەوە هەیبوو.

دوایی تێگەشتم کە هەردووکمان وویستمان ڕۆحمان بە یەک چارەنووسەوە گرێ بدەین، بەڵام یەک قوتابخانەی زانستی ئاینی لە فەرەنسادا هەبوو، ئەویش Zaragoza بوو. دڵم ئارامی لێبڕا. لە خانووەکانی سەدەی ناوەڕاستم ئەڕوانی، وە لە چاڵەکەی شەوی ڕابردووم ئەڕوانی. بێدەنگ و خەفەتبار ئافرەتێکی ترم هێنایەوە بیری خۆم کە ڕۆژگارێک ئەو ئافرەتە خۆم بووم.

ترسم لە خۆم دوورخستەوە و تەمەنام کرد: ( خودایە، خەریکم تێنەکۆشم کە ئیمانم بە دەست بێنمەوە. لە نیوە ڕێگەی وەها داستانێکدا فەرامۆشم مەکە. )

لەو کەمێك خەوت، وە دیسانەوە من بە خەبەر مامەوە، چاوم بڕییەوە پە نجەرەی تاریك. دوایی بەخەبەر هاتین و لەگەڵ ئەو خانەوادەیەدا نانی ئێوارەمان خوارد، خانەوادەیەك کە هەرگیز لەسەر مێزی نان خواردن قسەیان نەدەکرد، وە ئەو کلیلی خانووەکەی ئەویست.

بە خا نمی خاوەن ماڵەکەی ووت: ( ئەمشەو درەنگ ئەگەڕێینەوە. )

وەڵامی دایەوە: ( لاوەکان ئەبێت کات بە خۆشی بەسەر بەرن و بە باشترین شێواز لە پشووەکانیان سودمەند بن. )

هەر ئەوەندەی کە سواری ئوتۆمۆبیلەکە بووین، ووتم: ( ئەبێ شتێك لە تۆ بپرسم. زۆر هەوڵم دا هیچ پرسیارێك نەکەم، بەڵام ناتوانم. )

ووتی: ( پەرستگا. )

ــ ( هەر ئەمەیە. تێناگەم. )

بیرم کردەوە: ( هەرچەندە گرنگ نییە ئیتر لە شتێك تێبگەم. )

ووتی: ( هەمیشە تۆم خۆشوویستووە. ئافرەتانیکی تریش هەبوون، بەڵام هەمیشە تۆم خۆشوویستووە. ئەو مەدالیایە هەمیشە لەگەڵمدا بووە، بیرم ئەکردەوە ڕۆژێك ئەتوانم ئەو مەدالیایەت بۆ بگەڕێنمەوە، بۆ ئەوەی توانای ئەوەم هەبێت و بوێرم کە بڵێم ( خۆشم ئەوێی. )

هەموو ڕێگەکانی دنیا لە سەرئە نجامدا من بۆ لای تۆ ئەگەڕێننەوە. نامەم نوسی، وە هەموو وەڵامەکانی تۆم بە ترس و لەرزەوە ئەکردەوە ــ چونکە لەوانە بوو لە یەکێك لەو نامانەدا بۆم بنوسی کە پیاوێکت پەیدا کردووە.

دوایی ئەوە ژیانی ڕۆحانیم زیاتر ئەخوێندەوە. یا باشترە بڵێم، بە زۆر خوێندنەوەی ڕازی بووم، چونکە، لە سەرەتای منداڵیمەوە بوونی هەبوو، هەر

بەو شێوەیەی کە تۆ هەبوویت. تێگەیشتم کە شایستەیی خودا لە ژیانمدا زیاتر لە مانەیە، وە ئەگەر لەسەر بەرنامەکەم بەردەوام نەبم، ناتوانم شادمان بم. ڕووخساری مەسیح لە هەر بەشێکی دنیا کە ئەمبینی ئامادە بوو، وە نەمدەتوانی نەیبینم. )

بێدەنگ بوو، وە بڕیارمدا جەختی لەسەر نەکەمەوە.

دوایی بیست خولەك، ئوتۆمۆبیلەکەی ڕاگرت و دابەزین.

ووتی: ( لە "لۆرد" داین، ئەبێ ئێرە وەکو هاوینە هەوارێك ببینی. )

من تەنها شەقامە چۆڵەکان، دووکانە داخراوەکان و میوا نخانەکانم بینی کە تەلبەنی ئاسنینیان بە دەوریاندا کێشا بوو.

درێژەی پێدا: ( هاوینان شەش ملیۆن خەڵك دێنە ئێرە. )

ـــ ( بۆ من وەکو شارێکی ئازاردانی جنۆکە وایە. )

لە پردێك پەڕینەوە. لە پێشمانەوە، دەروازەیەکی ئاسنینی گەورە کە لە هەر لایەکیەوە بە فریشتە دەورە درابوو. چووینە ژوورەوە.

هەرچەند کەمێك لەمەو پێش بڕیارم دابوو جەخت نەکەمەوە، ووتم: ( درێژە بە گفتەکانت بدە. سەبارەت بە ڕووخساری مەسیح لە ڕووانگای خەڵکیەوە بدوێ. )

تێگەیشتم ئامادە نییە درێژە بە گفتەکانی بدات. لەوانەیە بۆ ئەوە بووبێت کە ئەو شوێن و کاتە هی ئەو قسەیە نەبووبێ. بەڵام ئێستا کە دەستی پێکردووە، ئەبووایە تەواوی بکردایە.

لە شەقامێکی فراوانـدا کەوتینـە ڕێ کـە هـەر دو لای شـەقامەکە بـە بـەفر داپۆشرا بوو. لە دوورەوە کەنیسەیەکی گەورەم بینی کە ڕەشی ئەکردەوە.

دووبارەم کردەوە: ( درێژەی پێبدە. )

ـــ (خۆت ئەوی تری ئەزانی. چوومە پەرستگاوە. ســاڵی یەکــەم، لــە خــودام ئەویست هاوکاریم بکات ئەوینی تۆ بە ئەوینی هــەموو مرۆڤــەکان بگۆڕمــەوە. ساڵی دووەم، هەستم کرد خودا گوێ بیستی دەنگمە. ساڵی سێیەم، هەرچــەندە ئازاری دووری تۆ زۆر گەورە بوو، بەڵام ئیتر دڵنیا بــووم کــە ئــەم ئەوینــە بــۆ چاکسازی، پاڕانەوە، و یارمەتیدانی موحتاجان گۆڕاوە.)

ـــ (کەوایە بۆچی دووبارە بە دوامدا هاتی؟ بۆچی دووبارە ئــەم ئــاگرەت لــە ناخی مندا بەرپا کرد؟ بۆچی مەشقی "کەسێکی ترت" بۆ باسکردم و بە ئاگات هێنامەوە تا بزانم ژیانم چەندە سادە و ساکارە؟)

دەستەواژەکان شێواو و لەرزان بوون. سات بە سات ئەوم بەم شێوەیە ئەبینی کە لە پەرستگا نزیك ئەبێتەوە و لە من دوور ئەکەوێتەوە.

ـــ (بۆچی گەڕایتەوە؟ بۆچی ئەمڕۆ ئــەم داســتانە دەگێڕیتــەوە کــە ئــەزانی ئەویندارت بووم؟)

پێش لە وەڵام دانەوە هەڵوێستەیەکی کرد.

ووتی: (لەوانەیە وا بزانی کارێکی گێلانەیە.)

ـــ (وا نازانم گێلانە بێت. ئیتر ناترسم بە گێل لە قەڵەم بدرێم. تۆ ئەمــەت فێر کردم.)

ـــ (دوو مانگ لەمەوبەر، ئەو کەسەی کە زانایی لە سەروو منەوە بــوو داوای لێکردم کە لە گەڵیدا بڕۆم بۆ ماڵی ئافرەتێــك کــە تــازە مردبــوو وە تــەواوی سامانەکەی بە پەرستگا بەخشیبوو. ئەو ژنە لە سەن ساوەن دەژیا، مامۆستاکەم ئەبوایە ڕەش و سپی ئەو سامانەی جیا بکردایەتەوە.)

کەنیسەی گەورەی دوور، سات بە سات نزیکتر ئەبوویەوە. بە بەرچاو ڕوونی بە ئامم ئەووت هەر ئەوەندەی کە گەشتینە ئەوێ، هەموو گفتوگۆکــان کۆتاییــان پێ دێت.

ووتم : ( گفتەكانت مەبڕە. من ئازاردراوی ڕوونكردنەوەیەكم. )

ـــ ( ئەو ساتەم لە یادە كە چووینە ناو ئەو خانووەوە. پەنجەرەكان بە ڕووی كێوی "پیرنە"دا ئەكرانەوە، و هەتاو بە درەوشانەوەی بەفرەكان تەواوی بۆشایی پڕ كردبوو. دەستم كرد بە جیا كردنەوەی ڕەش و سپی لە پێویستیەكانی ماڵەوە، بەڵام دوای چەند خولەكێك ناچار بووم دەست لەو كارە هەڵبگرم.

تێگەیشتم كە ڕۆحی ئەو ژنە بە تەواوەتی وەكو ڕۆحی من بووە. ئەویش هەمان لاپەڕەكانی مۆسیقاو ، ئەو ئاهەنگانەی منی هەبوو كە حەزم ئەكرد بیانبیستم لە كاتی تێڕوانینمدا بۆ دەرەوە.كتێبخانەكەشی پڕ بوو لەو كتێبانەی كە من خوێندبوونمەوە وەیا زۆر موشتاق بووم كە بیا نخوێنمەوە. سەرنجی مۆبیلاتەكان و تابلۆكان و وەسایلە بچووكەكانم دا، وەك ئەوەی خۆم ئەوانەم هەڵبژاردبێت.

لەو ڕۆژە بە دواوە، ئیتر نەمدەتوانی بیر لەو ماڵە نەكەمەوە. هەر كاتێك بۆ نزاو پاڕانەوە دەچوومە كەنیسەوە، دەمهێنایەوە یادی خۆم كە بە تەواوی دنیام تەرك نەكردووە. خۆمم لەگەڵ تۆدا ئەبینیەوە، لە كاتێكدا كە لە وەها خانوویەكدا ژیا نمان بەسەر ئەبرد، گوێم بۆ ئەو پارچە مۆسیقایە ڕادەدێرا، سەیری بەفری كێوەكان و ئاگری زۆپاكەم ئەكرد, لە خەیاڵمدا منداڵەكا نمانم لە حاڵەتی ڕاكردن و یاری كردن لە باخچەی دەورو بەری سەن ساوەندا ئەبینی. )

هەرچەندە هەرگیز نەچووبوومە نێو ئەو خانووەوە، بە تەواوی ئەمزانی كە شێوەی چۆنە و چ شێوەیەكی هەیە. وە حەزم ئەكرد كە ئیتر هیچ نەڵێت، تا بتوانم خەیاڵ پلاوی بكەم.

بەلام درێژەی پێدا :

ـــ ( دوو هەفتە لەمەوپێش ئیتر نەمتوانی بەرگەی خەمی ڕۆحم بگرم. ڕۆشتم بۆ لای مامۆستاکەم کە زانیاری لە سەرو منەوە بوو، هەموو شتێکم بۆ باسکرد. داستانی ئەوینم لەگەڵ تۆدا بۆ باسکرد، وە ووتم لەکاتی نوشتە کرندندا چ هەستێك بۆ من هاتووەتە ئاراوە. )

باران نم نم ئەباری. سەرم داخست و قەمسەڵەکەم داخست. لە بیستنی پاشماوەی داستانەکە ئەترسام.

ـــ ( دوایی مامۆستاکەم ووتی: کۆمەڵە ڕێگایەکی زۆر هەیە بۆ خزمەت کردن بە ئاینی خوداوەند. ئەگەر وا ئەزانی سەرنویشت ئەمەیە، بە دوایدا بڕۆ. تەنها کەسێك کە شاد بێت ئەتوانێت شادی بەرپا بکات.

وەڵامم دایەوە: نازانم ئەمە سەرنویشتی منە یان نا. کاتێ بڕیارمدا بچمە ناو ئەم پەرستگایەوە، گەشتم بە ئارامی.

ووتی: کەوایە بڕۆ هەموو گومان و ڕاڕاییەکان لە ناو ببە. لە دنیادا بمێنە، یا بگەڕێوە بۆ پەرستگا. بەڵام هەر کامیانت هەڵبژارد، دەبێ بە تەواوی وجودت لەوێ بی. مەلیك و مەملەکەتێك و ویلایەتێکی پارچە کراو لە بەرامبەر هێرشی دوژمندا خۆی ڕاناگرێ. مرۆڤێکی دوو پارچە ناتوانێت بە هەتاوگری لەگەڵ ژیاندا ڕوو بەڕوو بێتەوە. )

دەستی برد بۆ گیرفانی و شتێکی بە من بەخشی. کلیلێك بوو.

ـــ ( مامۆستاکەم کلیلی ئەو خانووەی بە قەرز پێدام. ووتی ئەتوانیت فرۆشتنی ناو ماڵەکەت بۆ ماوەیەك دوا بخەی. دەزانم کە خەز نەکات لەگەڵ تۆدا بگەڕێمەوە بۆ ئێرە.

ئەو بوو کە ووتاردانەی لە مەدرید تەرتیب کردبوو ـــ تا بتوانین یەکتری ببینین. )

سەیری ئەو کلیلەم کرد کە لە نێو دەستمدا بوو تەنها پێکەنیم. بەلام لە ناخەوە، وەك ئەوەی هەموو زەنگەکان لێدرا بن و ئاسمان فراوان بوو بوو. بە شێوازێکی تر خزمەتی خوداوەندی ئەکرد ـــ لە کەناری من. چونکە من ئەموویست لە پێناویدا بجەنگم.

ووتی : ( کلیلەکە بگرە. )

دەستمم درێژ کرد، و کلیلەکەم خستە نێو گیرفانمەوە.

کەنیسەیەکی گەورەتر لە سەر ڕێگامان بوو، پێش لەوەی کە بتوانم شتێك بلێم، کەسێك ئەوی بینی و هات بۆ پێشوازی کردنی. باران بە لێزەمە ئەباری، وە نەمدەزانی چەندێك لەوێ ئەمێنینەوە، سات بە سات بە بیری خۆمم ئەهێنایەوە کە تەنها یەك دەس جل و بەرگم هەیە نابێ پیسی بکەم.

هەوڵمدا بیری خۆم بەم بابەتەوە ببەستمەوە. ئەمئەویست بیر لە ماڵەوە بکەمەوە ـــ بیر لە شتانێك بکەمەوە کە لە نێوان زەوی و ئاسماندا ئاوێزان بوون و لە چاوەڕوانی دەستی سەرنویشتدا بوون.

بانگی کردم و بە چەند کەسێکی ناساندم. پرسیاریان لێکردم کە لە کوێ دەژین و خەڵکی کوێن، کاتێك کە ئاماژەی بە سەن ساوەن کرد، کەسێك ووتی مریەمی مقەدەس لەوێدا دفن کراوە. ئەیانووت ئەو ئەو چاڵەی لە ناوەڕاستی مەیداندا دۆزیوەتەوە .

کەسێکی تر ووتی : ( هێشتاش هەر لەوێدا ئەژین. )

نەمدەزانی ئەم داستانە لە ڕشاستیەوە نزیکە یان نا، وە نەمدەزانی چ کەسانێك هێشتا لەوێدان.

کەسانێکی تریش لە ڕێوە دەگەشتن، وە کۆمەلێك ڕوو بە ئەشکەوت بەڕێ کەوتبوون. پیاوێکی دنیا دیو و بە ساڵا چووی تر هەوڵیدا سەبارەت بە

فەرەنسا شتێك بە من بڵێت. کاتێ تێگەیشت بە باشی تێناگەم، بە زمانی ئیسپانی دەست و پێ شکاوەوە ووتی:

ــ (تۆ لەگەڵ مرۆڤێکی زۆر گرنگدایت، مرۆڤێك کە توانای سەیر و سەمەرە کردنی هەیە.)

وەڵامم نەدایەوە، بەڵام کەوتمەوە یادی ئەو شەوەی بیلباو. لە کاتێکدا کە مرۆڤێکی دەردەدار بە دوای ئەودا هات. بە منی نەووتبوو بۆ کوێ ڕۆشتوە، بۆ من گرنگ نەبوو. ماڵەوە سەرنجی ڕاکێشا بووم، کە بە تەواوی ئەمزانی چۆن چۆنی یە.... کتێبەکانی، پەڕاوە مۆسیقاکانی، سروشتی دەرەوەی، زینەتەکانی ناوەوەی.

لە جێگەیەکی ئەم دنیایەدا، لە ڕاستیدا ماڵێك چاوەڕوانی ئێمە بوو... ڕۆژێك بۆ ئەوێ ئەڕۆشتین. ماڵێك کە لە ناویدا، بە ئارامی بە چاوەڕوانی هاتنە ژوورەوەی ئەو ئەمامەوە. ماڵێك کە تیایدا ئەمتوانی چاوەڕوانی گەڕانەوەی کوڕێك یان کیژێك بکەم کە لە قوتابخانە ئەگەڕێتەوە، تا بێت و گەردون لێوان لێو لە شادی بکات، وە هەموو پێداویستیەکانی ماڵەوە تێك و پێك بدات.

کۆمەڵێك بووین بە بێدەنگی لە ژێر باراندا ڕێمان ئەکرد، تا سەرئەنجام گەشتینە شوێنی مەبەست. کتومت بەو شێوازە بوو کە بیرم لێدەکردەوە: ئەشکەوت، هاوشێوەی خانمیمان، کانیاوێکی دا پۆشراو بە شوشە ــ کە لەو سەیر و سەمەرەیەدا ناو سەرچاوەی گرتبوو. چەند زیارەتکەرێك دۆعا و نزایان ئەخوێند، کەسەکانی تر بە چاوی داخراوەوە، بە بێدەنگی لە ئەشکەوتەکە دانیشتبوون. لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا جۆگەلەیەك هەبوو کە ئاوی لەبەر ئەڕۆشت، وە دەنگی ئاوەکەی ئارامی ئەکردمەوە. بە بینینی ئەم وێنەیە، بە

خێرایی دۆعایەکم کرد، داوام لە کچە مریەم کرد یارمەتیم بدات، چونکە دڵم ئیتر تەحەمولی ڕەنج کێشانی نەئەکرد.

ووتم: (ئەگەر ئازار ئەبێ بێت، یا زووتر بێت. چونکە تەواوی تەمەنم لە بەردەستدایە، وە ئەبێت بە باشترین شێواز بەڕێی بکەم. ئەگەر ئەو ئەبێت هەڵبژاردن بکات، هەرچی زووترە با بیکات. لە دوایدا بە چاوەڕوانی ئەو ئەمێنمەوە، یا فەرامۆشی ئەکەم.

چاوەڕوان کردن ئازار هێنەرە. فەرامۆش کردن ئازار هێنەرە. بەڵام بێ نەخشە و پیلانی لە هەموو ڕەنجێك خراپ ترە.)

لە ساترۆیی دڵمەوە، هەستم کرد کە دواکارییەکانی منی بیست.

# چوار شەممە

# 1934 /12/8

کاتێ کاتژمێری کەنیسە نیوەی شەوی بەیان کرد، کۆمەڵێك کە دەوریان دابووین ڕووی لە زیاد بوون کرد. بە نزیکەیی سەد نەفەر بووین وە لە کۆمەڵی ئێمە ڕۆحانیان و عابیدەکان بەدی ئەکران، لە ژێر باراندا وەستا بووین و چاومان بڕیبووە پەیکەرەکەوە.

کاتێ کە دەنگی زەنگی کاتژمێرەکە دیسان وەستا، کەسێك لە کەنارمدا ووتی:

( درود بۆ کچە مریەم لقاح مقدسی ئێمە ! )

هەمووان دەستیان بەرز کردەوەو ووتیان: " درود ! "

پاسەوانێك بە خێرایی نزیك بوویەوە و داوای لێکرین کە دەنگە دەنگ نەکەین.دەبوینە مایەی بێزارکردنی زیارەتکەرەکانی تر.

پیاوێك لە کۆمەڵەکەی ئێمە ووتی: ( ئێمە لە ڕێگەی دوورەوە هاتووین. )

پاسەوانەکە وەڵامی دایەوە: ( ئەوانیش بە هەمان شێوە ) وە ئاماژەی بە کەسانێك کرد کە لە ژێر باراندا عیبادەتیان ئەکرد و درێژەی پێدا: ( وە بەبێ دەنگە دەنگ دۆعا ئەکەن. )

حەزم ئەکرد ئەم مەلاقاتە تەواو ببێت. حەزم ئەکرد لەگەڵ ئەودا بە تەنیایی بمێنمەوە، دوور لێرە، دەستەکانی بگرم و هەستەکانمی پێ بڵێم. ئەبێت سەبارەت بە ماڵەوە بدوێین، نەخشە دابڕێژین، سەبارەت بە ئەوین بدوێین. دەبوایە ئەوم ئارام بکردایەتەوە، هەستەکانم زیاتر پیشانی بدایە، دەمووت کە ئەتوانێت خەونەکانی ڕاستی ببەخشن ـــ چونکە لە پەنایدا بووم، چونکە یارمەتیم ئەدا.

پاسه‌وانه‌كه كه‌مێك دوور كه‌وته‌وه و یه‌كێك له ڕۆحانییه‌كان به ده‌نگێكی ئارام و له‌سه‌رخۆ به ته‌سبیحه‌كه‌ی ده‌ستی كرد به زیكر كردن. كاتێ گه‌شتینه كۆتایی دۆعاكان، هه‌مووان بێده‌نگ بوون و چاوه‌كانیان داخست.

پرسیارم كرد: ( ئه‌وانه كێن ؟ )

وه‌ڵامی دایه‌وه: ( خاوه‌ن ویژدان و كه‌رامه‌ته‌كان. )

پێشتر ئه‌م ده‌سته‌واژه‌یه‌م نه‌بیستبوو، به‌ڵام به ته‌واوی نه‌مده‌زانی چییه. تێگه‌شت.

ووتی: ( كه‌سانێكن كه ڕازین به ئاگری ڕۆح القدس. ئاگرێك كه عیسا به‌جێی هێشت، به‌ڵام كۆمه‌ڵێك بۆ داگرساندنی مۆمه‌كانیان به‌كاری دێنن. كه‌سانێك هه‌ن كه له بنه‌ما و بنه‌ڕه‌تی مه‌سیحیه‌ته‌وه نزیكترن، به ده‌ورانێك كه هه‌مووان نه‌یانتوانی سه‌یر و سه‌مه‌ره بكه‌ن. )

له دوایدا به چاوانی ئاماژه‌ی به كچه مریه‌م كرد و ووتی: ( كه‌سانێك هه‌ن كه به هۆی ئافره‌تی هه‌تاو پۆشه‌وه* هیدایه‌ت ده‌درێن. )

كۆمه‌ڵێك به هێواشی ده‌ستیان به دۆعا كردن كرد، وه‌ك بڵێی په‌یڕه‌وییان له ڕیاكاری كردبێ.

ووتی: ( خه‌ریكه له ناو سه‌رمادا ئه‌له‌رزی. پێویست ناكات به‌شداری بكه‌یت. )

* هه‌تاو پۆش : ئاماژه به بابی 12 ، ئایه‌تی 1 : هێمایه‌كی گه‌وره له ئاسماندا به‌ده‌ر كه‌وت. ئافره‌تێك كه هه‌تاوی له به‌ردایه و مانگ له ژێر پێكانیدایه و تاجێكی دوانزه ئه‌ستێره‌یی له سه‌ردایه.

ـــ ( تۆ ئه‌مێنیته‌وه ؟ )

ـــ ( ئه‌مێنمه‌وه. ئه‌مه ژیانی منه. )

هەرچەندە هەوڵم ئەدا لەوێ دوور بکەومەوە، وەڵامم دایەوە: (کە وایە منیش لەمەوێت لێرە بمێنمەوە. ئەگەر ئەمە دنیای تۆیە، دەمەوێ فێر بم کە بەشێك بم لەو ژیانی تۆیە.)

کۆمەڵەکە درێژەیان بە خوێندنی دۆعا دا. چاوەکانم داخست، وە هەوڵمدا لاوێزانی مۆسیقاکە بم، هەرچەندە زمانی فەرەنسیشم نەدەزانی. دەستەواژەکانم تەنها لە ڕووی دەنگیان دووبارە ئەکردەوە بەبێ ئەوەی کە لە واتایان بگەم. بەڵام ئەم کارە هاوکاریی کردم بە تێپەڕ بوونی کات باشتر بێمە جۆش.

بە زوویی تەواو ئەبوو. دوایی ئەمانتوانی بگەڕێینەوە بۆ سەن ساومن. تەنها ئێمە دوو نەفەر.

بە شێوەیەکی خۆ ویستانە درێژەم بە خوێندنی دۆعاکان دا. کەم کەم تێگەشتم کە مۆسیقا سەرتا پای داگرتووم، وەك ئەوەی زیندوو بێت و دەیتوانی هیپنۆتیزمی ئێمە بکات. سەرما بەسەرچوو بوو و باران ئیتر ئازاری نەئەدام. مۆسیقا حاڵی باشتر کردم، ڕۆحمی شاد کرد، منی بۆ دەورانێك برد کە خودا لێمەوە نزیکتر بوو وە یارمەتی ئەدام.

زۆری نەمابوو بە تەواوی خۆم ئاوێزانی مۆسیقاکە بکەم، مۆسیقاکە پچڕا. چاوەکانم کردەوە. ئەم جارە پاسەوانەکە دیار نەبوو، بەڵکو قەشەی مەسیحیان دیار بوو. ڕوو بە یەکێك لە ڕۆحانیانی کۆمەڵەکە هات. بە دەنگێکی ئارام و لەسەرخۆ بڕێك پێکەوە قسەیان کرد، وە قەشەکە ڕۆشت.

ڕۆحانییەکە ڕووی لە ئێمە کرد:

ــــ (دەبێ لەو بەری ڕووبارەکەوە درێژە بە دۆعاکانمان بدەین.)

لە بێدەنگیدا، ڕوو بە شوێنی دیاری کراو ڕۆشتین. بەسەر پردێکدا تێپەڕین کە لە بەردەم ئەشکەوتەکەوە بوو ڕۆشتین بۆ ئەو بەری ڕووبارەکە. ئەوێ خۆشتر

بوو: درەختەکان، دەشتێك، و ڕووبارێك ــ ئێستا لە نێوان ئێمە و ئەشکەوتەکەدایە. لەوێدا ئەمانتوانی پەیکەری درەوشاوە بە ڕوونی ببینین و دەنگمان هەڵبڕین، بەبێ ئەوەی هەستێکی ناخۆشمان لا دروست بێت و ببێتە هۆی بێزارکردنی کەسانی تر.

حەتمەن هەموو کۆمەڵەکە ئەم هەستەیان لا دروست بوو بوو، چونکە بە دەنگێکی بەرزتر دەستیان بە خوێندنی نزاکان کرد، ڕوویان کردە ئاسمان و پێدەکەنین کاتێ دڵۆپە باران بە سەر گۆنایاندا دەهاتە خوارەوە. کەسێك دەستی بەرز کردەوە و دوای ساتێك هەمووان دەستیان بەرز کردەوە و لەگەڵ مۆسیقادا بەم لاو لادا دەچەمانەوە.

لە لایەکەوە هەوڵم ئەدا خۆم بەدەستەوە بدەم، وە لە هەمان کاتدا دەمویست سەرنج لەوە بدەم کە ئە نجامی ئەدەم. قەشەیەکی مەسیحی لە پەنامدا بە زمانی ئیسپانی ئاوازی ئەخوێند، وە هەوڵم ئەدا دەستەواژەکانی دووبارە بکەمەوە. بە روح القدس و کچە مریەم پەیوەست دەبوو ــ تا ئامادە بن و بەرەکەت و توانای خۆی بەسەر هەمووانڈا ببارێنێ.

قەشەیەکی تر ووتی: (ووتاردان بە زمانە جیاوازەکان بۆ ئێمە خەڵاتە.) وە ئەم ڕستەیەی بە ئسپانی، ئیتالی و فەرەنسی دووبارە کردەوە.

دوایی بە تەواوەتی ئەمزانی چی بوو. هەموو کەسێك دەستی بە ووتاردان کرد بە زمانی جیاواز کە هیچ یەکێك لەو زمانانە ناسراو نەبوون و نامۆ بوون. زیاتر دەنگە دەنگێك بوو تا زمان، بە دەستەواژە گەلێك کە دەستبەجێ لە ناخەوە هەڵدەساترێن، بەبێ هیچ واتایەکی مەنتقی. بەخێرایی ووتەکانی ناو کەنیسەم بە بیر خۆم هێنایەوە، ئەو سەبارەت بە کەشف کردن بۆم دوا، سەبارەت بەوەی کە هەموو مرۆڤە بچوکەکان بێ ئاگان لەوەی کە گوێ بۆ ڕۆح ڕادێرن.

بیرم كـردەوە: ( لەوانەیـە زمـانی فریـشتەكان بێـت )، هـەوڵم دا لاسـاییان بكەمەوە. بە چاوەكانم بە دوای ئەودا ئەگەڕام، وە بینیم كە كەمێك لە پـێش منەوە ڕاوەستاوە. دەستەكانی بۆ ئاسمان بەرز كردبۆوە، وە ئەویش بە خێرایـی دەستەواژەكانی ئەووتەوە، وەك بڵێی لەگەڵ ئـەودا، لەگـەڵ كـچە مریـەم دا ئەدوێت. زەردەخەنەی ئەكرد، تەئكیدی ئەكردەوە، وە هەنـدێ جـار سەرسـام ئەبوو.

بیرم كردەوە: ( ئەمە دنیای ئەوە. )

وە ترسام. پیاوێك كە ئەموویست لە كەنارم بێت، ئەیووت خـودای ئـافرەتیش هەیە، بە زمانی نامۆ ئەدوا، ئەچووە خەڵوەتەوە، وەك ئەوەی كـە هاونـشینی فریشتەكان بوو بێت. ماڵێكی كوێستانی تر بە بیرمدا ئەدەهات، لـە بەشـێكی دنیایەك ئەچوو كە ئەو بەجێی هێشتبوو وە ئاوڕی لێ نەئەدایەوە.

تەواوی ئەو ڕۆژانە ـــ لە كاتی كۆنفرانسەكەی مەدریدەوە ـــ وەكو خـەونێك ئەهاتە پێش چاوم، كۆچێك بە خارج لە زەمان و مەكانی ژیانم. بـەڵام ئـەم خەونە چێژی دنیای هەبوو، چێژی ئەوین، چێژی بەسەرهاتی نوێ. هەرچـەند زیاتر بەرەنگاریم ئەكرد، زیاتر تێدەگەشـتم كـە ئـەوین بـە ئاسـانی دڵـی ئافرەتێك دەسوتێنێ درەنگ یا زوو، مۆڵەتم ئەدا با هـەڵبكات و نـاو دیـواری سەد وێران بكات. هەرچەندە لە سەرەتاوە ئامادەی بەربەرەكانی ئـەم هێرشـە ئەبووم، بەڵام زیاتر ئەویندار بـوو بـووم و وا بـیرم دەكـردەوە كـە ئـەتوانم حاڵەتەكان بخەمەوە ژێر ڕكێفی خۆم.

بەڵام شتێك بوو كە نەمدەزانی. ئەمە هەمان ئاینی كاسـۆلیك ئـەبوو كـە لـە قوتابخانە فێریان كردبووم. پیاوی ژیانم بەم شێوەیە نەئەخشاندبوو.

بە خۆمم ووت: ( پیاوی ژیانم، سەرسوڕهێنەر و عەجیبە )، وە لە بیری خۆمـدا سەرسام بووم.

له بەردەم ڕووبار و ئەشكەوت، هەستم بە ترس و ئیرەیە ئەكرد. ترس لەبەر ئەوەی كە هەموو شتێك بۆم تازە بوو، وە نوێكاری هەمیشە منی ئەترساند. ئیرەیی لەبەر ئەوەی كە كەم كەم تێدەگەشتم ئەوینی ئەو گەورەتر لەوەیە كە بیری لێدەكەمەوە.

ووتم: ( ببمبەخشە ئەی خانمی ئێمە. ئەگەر خۆ پەرستم، ئەگەر بچوكم، ئەگەر تەواوی ئەوینی ئەو پیاوەم بۆ خۆم ئەوێ، بمبەخشە. ) وە ئەگەر نامەی ئەو بە ڕاستی تەركی دنیا بوو، چی؟ ئەگەر بیویستایە خۆی لە پەرستگادا زیندانی بكات و لەگەڵ فریشتەكاندا بێتە گۆ چی؟

پێش لە بەجێهێشتنی ماڵ، پەڕاوەكانی مۆسیقا و كتێبەكان و گەڕانەوە بۆ ڕێگای ڕاستی چەندە بەرەنگاری ئەكرد؟ یا هەتا ئەگەر هەرگیز نەگەڕایەتەوە بۆ پەرستگا، بۆ دوور خستنەوەی لە خەونی ڕاستەقینەی ئەبوایە چ بەها و نرخێكم ببەخشیایە؟

وەك ئەوەی كە هەمووان تەركیزیان لەسەر ئەوە بوو كە ئە نجامیان ئەدا، جگە لە من. چاوەكانم بڕیبووە ئەو، وە ئەویش بە زمانی فریشتەكان ئەدوا.

تەنهایی جێگەی ترس و ئیرەیی گرتبۆوە. فریشتەكان كەسانێكیان هەبوو كە لە گەڵیدا بدوێن، وە من تەنها بووم.

نازانم چی بوو بە هۆی ئەوەی كە هەوڵ بدەم بەو زمانە نامۆیانە بدوێم. پێدەچێ نیازی ساترم بە گەیشتن بە ئەو، وە گەڕانەوەی هەستەكانم بوو. پێدەچێ لەبەر ئەوە بووبێ كە ئەموویست مۆڵەت بدەم ڕۆحم لەگەڵمدا بدوێ ـــ دڵم لێوان لێو بوو لە گومان، وە پێویستم بە وەڵام هەبوو.

بە باشی نازانم چی بكەم، هەستی شێتانەم زۆر گەورە بوو. بەڵام لێرەدا ئافرەتان و پیاوان لە هەموو تەمەنێك هەبوون، ڕۆحانی و كەسانی ئاسایی،

قەشە، خوێندکار و پیر. ئەمە شەهامەتی بە من بەخشی، وە داوام لە روح القدس کرد کارێك بکات تا بەسەر سەدی ترسدا زاڵ ببم.

بە خۆمم ووت: ( هەوڵ بدە. بدوێ و لێبڕاوانە بە شەهامەتەوە شتانێك بڵێ کە نایانزانی. هەوڵ بدە. )

بڕیارمدا هەوڵ بدەم. بەڵام سەرەتا دۆعام کرد ئەو شەوە ـــ شەو و ڕۆژێکی زۆر درێژ کە ئیتر بە یادم نەدەهێنایەوە چۆن دەستی پێکرد ـــ شەوێکی دیار و درەوشاوە بێت، سەرەتایەکی دووبارە بۆ من.

وەك ئەوەی خودا دەنگمی بیستبێ. دەستەواژەکانم کەم کەم ئاسانتر دەهاتنە دەرەوە ـــ وە دوای کەمێك واتای خۆیانیان لە زمانی مرۆڤەکانەوە لە دەستدا. هەستی شەرم ڕەوییەوە، بڕوا بە خۆ بوونم زیادی کرد، وە ئەو زمانە ئازادانە دەهاتنە سەر زمانم. هەرچەندە هیچ تێنەدەگەشتم کە چی ئەڵێم، بەڵام بۆ ڕۆحم واتادار بوو.

هەر لەبەر ئەوەی کە شەهامەتی ووتنی قسە گەلێکی بێ واتام هەبوو، هەستی خۆشحاڵیم بۆ گەڕایەوە. ئازاد بووم، پێویست نەبوو بۆ کردارەکانمی ڕوون بکەمەوە یا بڵێم. ئەم ئازادییە منی بۆ ئاسمان برد ـــ جێگەیەك کە ئەوینی بالا دەست، هەموو شتێك ئەبەخشێت، وە هەرگیز ڕێگە نادات هەست بە ڕاڕایی و دڵە ڕاوکێ بکەیت، جارێکی تر منی لە ئامێز گرتەوە.

سەرسام لە تەواوی سەیر و سەمەرەکانی ئەوین، بیرم کردەوە: ( ئەڵێی ئیمانم گەڕاوەتەوە. )

هەستم بە کچە مریەم ئەکرد لە پەنای خۆمدا، منی لە ئامێز گرتبوو، بە چادرەکەی دایدەپۆشیم و گەرمی ئەکردمەوە. دەستەواژە نامۆکان زۆر بە خێراتر لە دەمم دەهاتنە دەرەوە.

بێ ئەوەی کە هەست بە خۆم بکەم، گریام. شادی دڵمی پڕ کردبوو، نوقمی کرد بووم. بە تواناتر لە ترس بووو، بە تواناتر لە ئەبەدیەتی شێتانەم، بە تواناتر لە هەوڵەکانم بۆ دەستەمۆ کردنی هەر ساتێك لە ژیانم.

تێگەشتم ئەو فرمێسکانە خەڵاتێکن، هەر بۆیە لە قوتابخانە مەزهەبیەکاندا، قەشەکان فێریان کردبوو؛ کە قەدیسەکان لە خەڵوەتدا دەگرین. چاوەکانم کردەوە، سەیری ئاسمانی تاریکم کرد، وە هەستم کرد فرمێسکەکانم لەگەڵ باران ئاوێتە بوون. زەوی زیندوو بوو، ئاوێك کە لە ئاسمانەوە ئەهات، جارێکی تر سەیر و سەمەرەکانی ئاسمانی ئەهێنا. ئێمە بەشێك بووین لەو سەیر و سەمەرەیە.

هەروەکو چۆن کەسانی تر دەدوان، لە ژێر لێوەوە ووتم: (چ باشتر، خودا ئەتوانێت ئافرەت بێت، ڕوخساری مێینەی بوو کە هۆگر بوون بە ئەوینی فێری ئێمە کرد.)

ڕۆحانی بە زمانی ئسپانی، ئیتالی و فەرەنسی ووتی: (لە چادری هەشت ئەفەریدا عیبادەت بکەین.)

جارێکی تر گێژ بووم، بە تەواوی نەمدەزانی چی ڕوودەدات. کەسێك لێم نزیك بوویەوە و دەستی بەدەوری شانمدا ئەڵقە کرد. کەسێکی تر لە لایەکی ترمەوە هەر ئەو کارەی کرد.

لە ئەڵقەیەکی هەشت ئەفەریدا ڕاوەستاین. دوا بە دوای ئەوە، ڕوو بە پێشەوە چەماینەوە و سەرمان گەشت بە یەکتری.

وەکو چادرێکی مرۆیی دەهاتە بەرچاو. باران کەمێك توند تر دەباری، بەڵام هیچ کەس گوێی پێنەئەدا. ئەو چادرەی کە دروستمان کردبوو، تەواوی ووزە و گەرمایی ئێمەی کۆ ئەکردەوە.

دەنگی پیاوێك هات كە لە لای ڕاستمەوە شانی گرتبوو: ( با لقاح مقدس یارمەتی كوڕەكەم بدات تا ڕێگا بدۆزێتەوە. تكا ئەكەم بۆ كوڕەكەم ئاوازێكی ماریا بخوێنین. )

هەموو وەڵامیان دایەوە: ( ئامین. ) وە هەر هەشت ئەفەرەكە ئاوازی ماریامان خوێند.

ئاوازی ئافرەتێك لە "چادرەكەماندا" ووتی: ( با لقاح مقدس ڕووناكم كاتەوە و خەڵاتی شیفام پێ ببەخشێت. ئاوازێكی ماریا بخوێنین. )

جارێكی تر هەموو ووتیان ئامین و دۆعایان كرد.

هەر كەسێك داواكارییەكی هەبوو وە هەمووان بەشداریان ئەكرد لە دۆعاكەیدا. سەرم لە خۆم سوڕ دەما. چونكە وەكو منداڵێك دۆعام ئەكرد ـــــ وە وەكو منداڵێك، باوەڕم هەبوو كە ئەم هەست و سۆزە دەتوانرێت بەرجەستە بكرێت.

كۆمەڵەكە بۆ ساتێك بێدەنگ بوون. تێگەیشتم كە نۆبەتی منە داواكارییەكانم بڵێم. هەر كەسێكی تر بووایە لە شەرما ئەمرد و هیچی نەدەووت. بەڵام دۆستەكەم لەوێدا بوو، وە ئەم ئامادەبوونەی بڕوا بە خۆ بوونی بە من بەخشی.

ووتم: ( با لقاح مقدس فێرم بكات وەكو خۆی هۆگری ئەوین بم. كە ئەم ئەوینە لە من و لە پیاوێك كە ڕاوەستاوە لە بارەگای لقاح مقدس، ئەش و نما بكات. ئاوازێكی ماریا بخوێنین. )

پێكەوە دۆعامان كرد، وە دووبارە هەستم بە ئازادی كرد. ساڵانێك لە بەرامبەر دڵمدا جەنگا بووم، چونكە لە خەفەت، لە ڕەنج، و لە دەركەوتن دەترسام. هەمیشە دەمزانی كە ئەوینی ڕاستەقینە لە هەموو شتێك باڵا ترە، وە مردن باشترە لەوەی كە هۆگری ئەوین نەبێت.

بەڵام گومانم نەکرد تەنها کەسانی تر شەهامەتیان هەیە. وە ئێستا، لەم ساتەدا، تێگەیشتم کە منیش نەتوانم. هەرچەند بە واتای جیایی، تەنهایی، خەفەت بێت، ئەوین هەموو بەها و نرخێك دێنێت.

(ناتوانم بیر لەم شتانە بکەمەوە، دەبێ سەرنج لە مەراسیمەکە بدەم.)

قەشەیەك کە ڕێنمونی کۆمەڵەکەی دەکرد، داوای لێمان کرد کە چادرەکە بکەینەوە و کەمێك دۆعا بۆ نەخۆشان بکەین. هەموو عیبادەتیان ئەکرد، دەیا نخوێند و لە ژێر باراندا سەمایان دەکرد، ستایشی خودا و مریەمیان ئەکرد. لە هەر ساتێکدا، دووبارە دەستیان بە گفتوگۆ کردن ئەکرد بە زمانی نامۆ و بە دەست ئاماژەیان بۆ ئاسمان ئەکرد.

لە ناکاو ئافرەتێك ووتی: (کەسێك لێرەیە... کەسێك کە کچێکی نەخۆشی هەیە ... ئەوە بزانن کە کچەکەی شیفا درا.)

دۆعا کردن درێژەی کێشا، وە سرودی شادی بەردەوام بوو. لە هەر ساتێکدا، جارێکی تر دەنگی ئەو ئافرەتەم ئەبیست.

ـــ (کەسێك لەم کۆمەڵەدا هەیە کە دایکی لە دەست داوە، دەبێ ئیمانی هەبێت و بزانن کە ئەو لە پایەبەرزی مەلەکوت دایە.)

لە دوای مەراسم، ئەو پێی ووتم کە ئەم خەڵاتە بە نۆبەتە و هەندێ کەس ئەتوانن هەست بەو شتانە بکەن کە لە خاڵێکی دوور یا لە داهاتوودا ڕوودەدەن.

بەڵام هەرچەند هەرگیز ئەمەم نەدەزانی، بە توانای ئەو ئاوازە کە سەبارەت بە موعجیزات ئەدوا، باوەڕم هەبوو. چاوەڕوان بووم کە سەرئەنجام بدوێت سەبارەت بە ئەوینی دوو ئەفەر کە لێرەدا بوون. ئومێدەوار بووم ببیستم کە ئەم ئەوینە بۆ تەواوی فریشتەکان، قەدیسەکان، خوداوەند و خوای ئافرەت موبارەك و پیرۆزە.

نازانم ئه‌و مه‌راسیمه چه‌نده درێژه‌ی كێشا. خه‌ڵكی به‌ زمانی نامۆ ده‌دوان، ده‌یا نخوێند، به‌ به‌رزكردنه‌وه‌ی ده‌ستیان بۆ ئاسمان سه‌مایان ئه‌كرد، بۆ ده‌ورو به‌ره‌كه‌ی خۆیان دۆعایان ئه‌كرد، سه‌یر و سه‌مه‌ره‌یان ئه‌ویست، شتانێكی سه‌یر و سه‌مه‌ره كه‌ پێشتر ڕوویدابوو به‌ شه‌هاده‌تیان له‌ قه‌ڵه‌م ئه‌دا. سه‌رئه‌نجام، قه‌شه‌یه‌ك كه‌ مه‌راسیمه‌كه‌ی به‌ڕێوه‌ ئه‌برد، ووتی:

ـــ (با به‌ ئاوازه‌وه‌، دۆعا بكه‌ین ، بۆ ته‌واوی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ بۆ یه‌كه‌م جاره‌ له‌م شوێنه‌دا ئاماده‌ن.)

من به‌ تنها نه‌بووم. ئه‌مه‌ ئارامی كردمه‌وه‌.

هه‌موو دۆعایان ئه‌كرد. ئه‌م جاره‌ من ته‌نها گوێم ئه‌گرت و دۆعام ئه‌كرد كه‌ ئه‌م به‌ره‌كه‌ته‌ش به‌سه‌ر مندا ببارێت.

پێویستیم به‌ به‌ره‌كاتێكی زۆر هه‌بوو.

قه‌شه‌كه‌ ووتی: (مۆڵه‌ت بده‌ن به‌ره‌كه‌ته‌كان به‌ ده‌ست بێنین.)

هه‌موو ڕوو به‌ ئه‌شكه‌وتی ڕووناك له‌وبه‌ری ڕووباره‌وه‌ كه‌وتنه‌ ڕێ. باوكی ڕۆحانی دۆعا گه‌لێكی جۆر به‌ جۆری كرد و ئێمه‌ی پیرۆز كرد. دوای ئه‌وه‌ هه‌مووان یه‌كتریان ماچ كرد، ووتیان: (پیرۆز بێ ڕۆژی لقاح مقدس)، وه‌ به‌ ڕێگه‌ی خۆیاندا ڕۆشتن.

ئه‌و لێم نزیك بوویه‌وه‌. شادتر له‌ هه‌میشه‌ ده‌هاته‌ پێش چاو. ووتی:

ـــ (تۆ ته‌ڕ بووی.)

به‌ پێكه‌نینه‌وه‌ وه‌ڵامم دایه‌وه‌: (هه‌روه‌ها تۆش.)

سواری ئوتۆمۆبیل بووین و گه‌ڕاینه‌وه‌ بۆ سه‌ن ساوه‌ن. زۆر موشتاق و په‌رێشانی ئه‌م ساته‌ بووم، به‌ڵام ئێستا كه‌ هاتبووه‌ پێش، ئه‌مده‌زانی چی بڵێم. ئه‌مده‌توانی سه‌باره‌ت به‌ ماڵی كوێستان، مه‌راسیم، كتێبه‌كان ، په‌ڕاوه‌ مۆسیقیه‌كان و زمانه‌ نامۆكان و عیباده‌ت كردن له‌ چادردا بدوێم .

ئەو لە دوو جیهاندا ئەژیا. ئەم دوو جیهانەی، لە شوێنێکدا لە ڕۆژگارێکدا پێکەوە گرێ دابوو، وە ئەبووایە بمزانیبایە چۆن چۆنی.

بەلام لەو ساتەدا، دەستەواژەکانم بەرئەنجامێکی نەبوو. ئەوین تەنها بە هۆگر بوون بە ئەوینەوە دەردەکەوێت.

کاتێ چووینە ژوورەوە، ووتی: ( تەنها یەك بلورم هەیە. دەتوانی بەو بلورە کات بەڕێ بکەی. سبەی بلورێکی تر ئەکڕم. )

وەلامم دایەوە: ( جل و بەرگەکانمان دەخەینە سەر زۆپاکە. تا سبەی ووشك ئەبنەوە. بە هەر حاڵ، هێشتا ژێر کراسێکم هەیە کە دوێنێ شۆردم. )

چەند ساتێك، هیچ کامێکمان هیچمان نەووت.

جل و بەرگ. ڕووتی. سەرما.

سەرئەنجام، لە دۆلابێکی بچووك کراسێکی تری هێنایە دەرەوە.

ووتی: ( دەتوانی بەم کراسەوە بخەوی. )

وەلامم دایەوە: ( هەڵبەتە. )

چراکەم کوژاندەوە. لە تاریکیدا جل و بەرگە تەڕەکانم داکەند و لەسەر زۆپا پانم کردنەوە و نمرەی گەرمایی زۆپاکەم زیاد کرد.

ڕووناکی گلۆپی شەقامەکان ئەوەندە نەبوو کە بتوانێت وەکو تارماییەك بمبینێت و بزانێت کە ڕووتم.

کراسەکەم لەبەر کرد و خۆمم خستە ژێر بەتانیەوە.

ووتی: ( خۆشم ئەوێی. )

وەلامم دایەوە: ( خەریکم فێر ئەبم کە خۆشم بوێی. )

جگەرەیەکی داگیرساند.

پرسیاری کرد: ( وا دەزانی ساتی بەڵێن و بەیەك گەشتن بێتە پێش؟ )

ئەمزانی مەبەستی چییە. هەستام و لە لێواری تەختە خەوەکەی دانیشتم.

ئاگری جگه‌ره‌كه‌ی جار به‌ جار ڕووخساری ڕووناك ئه‌كرده‌وه‌. ده‌ستی گـرتم، و چـه‌ند سـاتێك بـه‌م شـێوازه‌ ماینـه‌وه‌. دوا بـه‌ دوای ئـه‌وه‌ ده‌سـتی به‌سـه‌ر زوڵفه‌كانمدا هێنا.

وه‌ڵامم دایه‌وه‌: (نه‌ ئه‌بوایه‌ پرسیارت بكردایه‌. ئه‌وین پرسیار ناكات، چونكه‌ مرۆڤ ده‌ست به‌ بیركردنه‌وه‌ ئه‌كات و دوایی كه‌م كه‌م تـرس دایـده‌گرێت. وه‌هـا ترسێك كه‌ باسكردنی زۆر دژواره‌، وه‌ هێنـانی بۆ سه‌ر زمان زۆر بێ سووده‌.

له‌وانه‌یه‌ ترس له‌ نائومێدی، ڕازی نه‌بوون ، غرور شكاندن بێـت. كـه‌ زۆر بـه‌ شێوه‌یه‌كی گێلانه‌ دێته‌ پێش چاو، له‌ ڕاستیشدا هه‌ر واشـه‌. هـه‌ر له‌بـه‌ر ئـه‌م هۆكاره‌ نابێت بپرسیت ده‌بێ به‌ كردار هه‌وڵی بۆ بده‌یت، هه‌ر به‌و شێوازه‌ی كـه‌ چه‌ند جارێك خۆت ووتووته‌ ، ئه‌بێ لێبڕاوانه‌ دڵ به‌ ده‌ریا بسپێریت.)

ـــ (ده‌زانم. له‌مه‌وبه‌ر هیچ كات ئه‌م پرسیاره‌م نه‌كردووه‌.)

به‌ شێوه‌یه‌كی وه‌ها خۆمم پیشاندا كه‌ گوێم له‌ ده‌نگی نه‌بووه‌ و ووتم:

( تۆ ئیدی دڵی منت به‌ ده‌ست هێناوه‌. سبه‌ی ئه‌توانیت بڕۆیت، وه‌ بۆ هه‌میـشه‌ سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ی ئه‌م چه‌ند ڕۆژه‌مان له‌ یاد بمێنێتـه‌وه‌، ئـه‌وینی ڕۆمانـسی، تواناكان، خه‌ونه‌كان.

به‌ڵام وا ده‌زانم كه‌ خوداوه‌ند لـه‌ حیكمـه‌تی موتڵـه‌قی خۆیـدا، دۆزه‌خـی لـه‌ ناوه‌ڕاستی به‌هه‌شتدا حه‌شار دابێت. بۆ ئه‌وه‌ی هه‌میـشه‌ بـه‌ سـه‌رنجه‌وه‌ لێـی بڕوانین. تا كاتێك به‌ ئه‌زمونی شادمانی و میهره‌بانی ئه‌گه‌ین، نابێ كۆڵه‌كه‌ و پایه‌ی به‌دبه‌ختی له‌ یاد بكه‌ین.)

ده‌ستی به‌سه‌ر زوڵفه‌كانمدا هێنا.

ووتی: (تۆ زۆر به‌ زوویی فێر ئه‌بی.)

له‌وه‌ی كه‌ ووتبووی سه‌رسام بووم. بـه‌ڵام ئه‌گـه‌ر هـه‌ر مرۆڤێـك بزانێـت كـه‌ ئه‌زانێت، ئه‌وه‌ ئه‌و مرۆڤه‌ زانایه‌.

ووتم: (وا نه‌زانی كه‌ من ئافره‌تێكی دژوارم. تۆ یه‌كه‌مین پیاو نیت كه‌ له‌ ژیانی مندا بوو بیت. وه‌ ئه‌مه‌ كاری یه‌كه‌م جارم نییه‌.)

وه‌ڵامی دایه‌وه‌: (هه‌روه‌ها منیش به‌ هه‌مان شێوه‌.)

هه‌وڵم ئه‌دا به‌ شێوازێكی ئاسایی ڕه‌فتار بكات، به‌ڵام به‌ فشاردانی ده‌ستی به‌سه‌ر سه‌رمدا تێگه‌یشتم كه‌ بیستنی ئه‌م ووته‌یه‌م زۆر بۆی دژوار بووه‌.

ـــ (به‌ڵام ئه‌مڕۆ ده‌مه‌و به‌یان، هه‌ستم كرد كه‌ كچێنیم به‌ شێوه‌یه‌كی دا پۆشراو بۆ گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌.

هه‌وڵ مه‌ده‌ تێبگه‌یت، چونكه‌ ته‌نها یه‌ك ئافره‌ت له‌ مه‌به‌ستم ئه‌گات. خه‌ریكم دووباره‌ ئه‌وین ئاشكرا ئه‌كه‌م، وه‌ ئه‌مه‌ش پێویستی به‌ كاتێكی زۆر هه‌یه‌.)

ده‌ستی به‌سه‌ر زوڵفه‌كانمدا هێنا و دوا به‌ دوای ئه‌وه‌ ده‌ستی به‌سه‌ر ڕوومه‌تمدا كێشا. به‌ ئه‌سپایی لێوه‌كانیم ماچ كرد و گه‌ڕامه‌وه‌ بۆ شوێن خه‌وه‌كه‌ی خۆم. به‌ باشی نه‌مزانی بۆچی به‌م شێوازه‌ ڕه‌فتارم كرد. نه‌مزانی ئه‌م كاره‌م كردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی له‌ خۆمی نزیك بكه‌مه‌وه‌ یان به‌ پێچه‌وانه‌وه‌.

به‌ڵام ڕۆژێكی درێژ بوو. ماندووتر له‌وه‌ بووم كه‌ بتوانم بیر بكه‌مه‌وه‌.

شه‌وێكی زۆر ئارامم هه‌بووم. ساتێك به‌ بیرمدا هات كه‌ به‌خه‌به‌ر هاتم ـــ به‌ڵام له‌ خه‌ودا بووم. بونێكی ئافره‌تانه‌ منی له‌ ئامێز گرتبوو، وه‌ك ئه‌وه‌ی ماوه‌یه‌كی زۆر بێ ناسیبێتم، چونكه‌ هه‌ستم نه‌كرد كه‌ ئه‌یه‌وێ پارێزگاریم لێ بكات و خۆشی ئه‌وێم.

كاتژمێر حه‌وتی به‌ره‌به‌یان، له‌ ناو گه‌رمادا به‌ خه‌به‌ر هاتم. بیرم كه‌وته‌وه‌ كه‌ پله‌ی گه‌رمی زۆپاكه‌م زۆر زیاد كردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی جل و به‌رگه‌كان ووشك ببنه‌وه‌. هێشتا هه‌وا تاریك بوو، هه‌وڵمدا به‌بێ ده‌نگی هه‌ستم بۆ ئه‌وه‌ی نه‌ بمه‌ مایه‌ی ئازار بۆی.

هەر ئەوەندەی کە هەستام، بینمیم کە ئەوی لێ نەماوە و ڕۆشتووە.
ترس دایگرتم. کەسێکی تر ( خەیاڵم ) بە زوویی ڕاچڵەکی و ووتی: ( دەبینی ؟ هەر ئەوەندەی کە خۆتت بە دەستەوە دا، بەجێی هێشتیت و ڕۆشت. وەکو هەموو پیاوەکانی تر. )
سات لە دوای سات ترس زیاتر دایدەگرتم. نەمئەویست ئختیارم لە دەست بدەم. بەڵام خەیاڵم هەمیشە ئەدوا:
ـــ ( هێشتا لێرەدام. بوارت دا هەوا ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێ، دەرگات والا کرد و ئەوین خەریکە ژیانت نووقم دەکات. ئەگەر بە خێرایی دەست بە کار بین، دەتوانین ئختیار بە دەست بێنین. )
ئەبوایە بە کرداری ڕەفتارم بکردایە. ئەبوایە هەموو لایەکی بۆ بگەڕامایە.
خەیاڵم درێژەی بە گفتەکانی دا: ( ئەو ڕۆشتووە. ئەتوانی تۆش ئەم شوێنە بەجێبهێڵیت و بڕۆی. ژیانت لە Zaragoza هێشتا لە شوێنی خۆیدایەتی: خێراکە بگەڕێوە. بەر لەوەی هەموو ئەو شتانە لە دەست بدەیت کە بە زەحمەت بە دەستت هێناون. )
بیرم کردەوە: ( هەڵبەتە بەڵگەیەکی بۆ ڕۆشتن هەبووە. )
خەیاڵم وەلامی دایەوە: ( پیاوەکان هەمیشە بەڵگەیان بۆ ڕۆشتن هەیە. بەلام ڕاستیەکەی ئەمەیە کە سەرئەنجام تەرکی ئافرەتەکان ئەکەن. )
کەوایە ئەبێ بزانم چۆن بگەڕێمەوە بۆ ئسپانیا. ئەبێ مێشکم لە هەموو ئان و ساتێکدا بخەمەگەڕ.
خەیاڵم ووتی: ( هەستین بە پراکتیزە کردنی کرداری: پارە. )
هەتا یەك عانەشم پێ نەبوو. ئەبوایە بچومایەتە دەرەوە، پەیوەندیی تەلەفۆنیم بە دایك و باوکمەوە بکردایە و داوام لێ بکردنایە کە پارەم بۆ بنێرن بۆ ئەوەی بلیتی گەڕانەوەمی پێ دابین بکەم.

به‌لام ئه‌مرۆ پشووه. تا سبه‌ی پاره به ده‌ستم ناگات. ئه‌ی بۆ خه‌و و خواردن چی بکه‌م ؟ ئه‌ی چۆن به خاوه‌ن ماڵ بڵێبم بۆ کرێی خانووه‌که‌یان دوو ڕۆژ ماوه‌م بده‌ن و ئارام بگرن ؟

خه‌یاڵم وه‌ڵامی دایه‌وه: (باشتر وایه هیچ نه‌ڵێی.) به‌ڵێ. ئه‌و به ئه‌زمونه، ئه‌زانێت چۆن له‌گه‌ڵ ئاسته‌نگه‌کاندا ڕووبه‌ڕو ئه‌بێته‌وه. کچه ووردیله‌یه‌کی ئه‌وینداری نییه که جڵه‌وی خۆی له ده‌ست بدات، ئافره‌تێکه که هه‌میشه ئه‌زانێت چی له ژیان ئه‌وێت. ئه‌بووایه هه‌ر له‌وێ بمایه‌مه‌وه، وه‌ك ئه‌وه‌ی که هیچ نه‌بووبێ، وه‌ك بلێی ئه‌و ئه‌گه‌ڕێته‌وه. کاتێ پاره‌که‌م به ده‌ست گه‌شت، قه‌رزه‌که‌م ئه‌ده‌مه‌وه و ئه‌ڕۆم.

خه‌یاڵم ووتی: (زۆر باشه. دیسانه‌وه خه‌ریکه ئه‌بیته‌وه به هه‌مان ئه‌و که‌سه‌ی که پێشتر بووی. خه‌مگین مه‌به ـــــ چونکه ڕۆژێك له ڕۆژان پیاوی خۆت ئه‌دۆزیته‌وه. پیاوێك که بتوانیت بێ دڵه ڕاوکێ خۆشت بوێ.)

جل و به‌رگه‌کانم له‌سه‌ر زۆپاکه داگرت. ووشك بوو بوونه‌وه. سه‌ره‌تا ئه‌بووایه بمزانیایه له کام شار له‌م دورو به‌رانه بانك هه‌یه، دوایی په‌یوه‌ندیم به دایك و باوکمه‌وه ئه‌کرد و کاره‌کانم ڕێکده‌خست.

ئه‌گه‌ر بیرم له‌مه ئه‌کرده‌وه، نیتر هیچ کاتێك بۆ گریان یان هه‌ستکردن به دڵته‌نگی نه‌ئه‌مایه‌وه.

له دوایدا یاداشتێکم به بیردا هات:

(ڕۆشتوومه‌ته په‌رستگاوه. پێداویستیه‌کانت کۆ بکه‌ره‌وه "ها ها ها !"، چونکه ئه‌م شه‌و ئه‌گه‌ڕێینه‌وه بۆ ئسپانیا. ده‌مه‌و ئێواره ئه‌گه‌ڕێینه‌وه.)

وه له کۆتایدا ووتبووی: (خۆشم ئه‌وێی.)

ياداشتەكانم لە ئامێز گرت، هاوكاتيش هەستم بە بەدبەختى و ئاسوودەيى نەكرد. سەرنجم دا كە خەيالم حەيرانە بە بيستنى ئەم هەواڵە تازەيە و گۆشە گيرە.

منيش خۆشم ئەويست، خولەك لە دواى خولەك و سات لە دواى سات ئەو ئەوينە پەرەى ئەسەند و گۆڕانكارى بەسەرمدا ئەهێنا. دووبارە باوەڕم بە داهاتوو هێنايەوە، وە كەم كەم خەريك بوو باوەڕم بە خودا ئەهێنايەوە.

وە هەموو ئەمانە تەنها لە پێناوى ئەويندا بوو.

بە توندى دەرگام بە ڕووى خەيالمدا داخست و بەڵێنم بە خۆم دا: (كە چيدى لەگەڵ خەيالمدا ئەدوێم. كەوتنە خوارەوە لە نهۆمى سێيەمەوە هەمان زەرەرى كەوتنە خوارەوەى هەيە لە نهۆمى "سەد"ەمەوە.)

ئەگەر ئەبوايە بكەوتمايەتە خوارەوە، باشتر وابوو لە بەرزترين شوێنەوە بكەومە خوارەوە.

ژنى خاوەن ماڵەكە ووتى: (ديسانەوە بە برسێتى مەچۆرە دەرەوە.)

بە سەرسوڕمانەوە وەڵامم دايەوە: (ئەمدەزانى كە تۆ زمانى ئسپانى دەزانى.)

ــ (سنوور نزيكە. هاوينان جيهان گەڕان و گەشتياران دێنە لۆرد. ئەگەر زمانى ئسپانى ئەزانم، ناتوانم ژوور بە كرێ بدەم.)

نانى تەنورى و شير و قاوەى بۆ دروستكرد. ويستم ڕۆحيەى خۆم بۆ ڕوبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو ڕۆژانەدا ئامادە بكەم، هەر كاتژمێرێك ساڵێك درێژەى ئەكێشا. ئومێدەوار بووم كە ئەم قاوەتيە كەمێك بێ ئاگام بكات.

پرسيارى كرد: (زۆر دەمێكە زەواجت كردووە؟)

وەڵامم دايەوە: (ئەو يەكەمين ئەوينى ژيانم بوو.) هەر ئەوەندە بەس بوو.

ژنەكە درێژەى بە گفتەكانى دا: (ئەو ساترانە لە دەرەوە ئەبينى؟ يەكەمين ئەوينى ژيانم لە يەكێك لەو كێوانەدا مرد.)

ـــ ( بەڵام تۆ پیاوێکت پەیدا کردووە. )

ـــ ( بەڵێ، پەیدام کـردووە. وە هـەروەها تـوانیم دووبـارە خۆشـبەخت بم.

چارەنوس زۆر سەرسوڕهێنەرە: هیچ کەسێك ناناسم کە بـە یەکـەمین ئـەوینی ژیانی زەواجی کردبێت.

کەسانێك کە زەواج ئەکەن هەمیشە بە من ئەڵێن شتێکی بە نرخیان لە دەسـت داوە و ئەوەندەی کە ئەیانتوانی، ئەژیاون. )

لە ناکاو دەستی لـە گفتـەکانی هـەڵگرت و ووتـی: ( داوای لێبـوردن ئەکـەم. نەموویست تۆمەتبارت بکەم. )

ـــ ( تۆمەتبارت نەکردووم. )

ـــ ( هەمیشە سەیری ئەو چاڵە ئەکەم لە دەرەوە و بیر ئەکەمەوە: پێشتر هـیچ کەس نەینەزانی ئاو لە کوێدایە، تا کاتێك کە ساوەنی پیرۆز بڕیاریـدا زەوی هەڵبکەنن ئاو پەیدا ئەکەن. ئەگەر ئەم کارەی نەئەکرد، ئەم شارە لـە خـوار ترەوە دروست ئەبوو، لە کەناری ڕووبارەوە. )

پرسیاری کرد: ( ئەمە چ پەیوەندییەکی بە ئەوینەوە هەیە ؟ )

ـــ ( ئەم چاڵە خەڵکی هێناوەتە ئێرە لەگەڵ ئومێدەکانیان و خەونەکانیان و تەنگ و چەڵەمەکانیاندا. کەسێك لێبڕاوانە بە دوای ئـاودا گـەڕا، ئـاو خـۆی پیشان دا، وە هەموو لە دەوری کۆ بوونـەوە. وا دەزانم کاتـێ لێبڕاوانـە و بـە ئازاییانە بە دوای ئەویندا بگەڕێین، خۆی پیـشان ئـەدات، وە ئـەوینێکی زۆر تریش ڕادەکێشێت. ئەگەر کەسێك ئێمەی بووێت، هەمووان ئێمەیان ئەوێت. بەڵام ئەگەر بە تـەنها بـین، تـەنها تـر ئـەبین. ژیـان زۆر سەرسـوڕهێنەر و سەیرە. )

پرسیارم کرد: ( تۆ هیچ شتێکت سەبارەت بە کتێبێـك بـە نـاوی "یی‌چینگ" بیستووە ؟ )

ـــ ( نەخێر، هيچ كات . )

ـــ ( ئەم كتێبە ئەڵێت كە ئەتوانى شارێك بگۆڕيت، بەڵام ناتوانيت چاڵێك لە شوێنى خۆيدا تەكان بدەيت. ئەوينداران لـە كـەنارى چـاڵدا يـەكترى پەيـدا ئەكەن، تينوويەتيان ڕوو لە زياد بوون دەكات، ماڵ پێكـەوە دەنـێن و ئەبنـە خاوەنى منداڵ .

بەڵام ئەگەر يەكێك لەوانە بڕيار بدات كـە بـڕوات، چـاڵەكە ناتوانێـت بـە دوايدا بڕوات. ئەوين هەر لەو شوێنەدا ئەمێنێتەوە، ئاشكرايە ـــ هەرچـەندە لێوان لێوە لە هەمان ئاوى پاكى پێشوو . )

ژنەكە ووتى : ( كچم، تۆ وەكو پيرە ژنێك ئەدوێيت كە زۆر ڕەنجى كێشا بێ . )

ـــ ( نەخێر. هەميشە ئەترسم. هيچ كاتێـك چـاڵم هەڵنەكەنـدووە. ئێـستا ئەمەوێ ئەو كارە بكەم و نامەوێ ڕەنجەكەى فەرامۆش بكەم . )

هەستم كرد شتێك لە گيرفانمدا ئازارم ئەدا. كاتێ زانيم چييە، دڵم بەسـتى. قاوەكەم بە خێرايى خواردەوە.

كليل. من كليلێكم پێ بوو.

ـــــ ( لەم شارەدا ئافرەتێك هەيە كە مردووە و هەموو شـتەكانى بەخـشيوەتە پەرستگاى "Tarbes" . تۆ ئەزانيت ماڵى لە كوێيە ؟ )

ژنەكە دەرگاى ماڵەوەى كردەوە و ماڵى ئافرەتەكەى پێ پيشان دام. يەكێك بوو لە ماڵەكانى سەدەى ناوەڕاست كە لە دەورى مەيدانێك بوو وە پشتى لە شـيو و كێوەكانى موشەڕەف بوو.

ووتى : ( دوو مانگ لەمەوبەر، دوو قەشەى مەسيحى ڕۆشتن بۆ ئەوێ. و .... )

بە نيگايەكى گومانـاويەوە لە منى ڕوانى.

دواى وەستانێكى درێژ خايەن ووتى : ( وە يەكێك لەوانە هاوشێوەى مێردەكـەى تۆ بوو . )

له کاتێکدا که ئەچوومە دەردوە، ووتم: ( خۆی بوو. ) لەوەی کـه ڕێگـەم دابـوو دەروونی منداڵم شەیتانی بکات، خۆشحاڵ بووم.

له بەردەم ماڵەکەدا ڕاوەستام، نەمدەزانی چی بکەم. تەم و مژ هـەموو شـتێکی داپۆشی بوو، وه وامدەزانی که له خەونێکی خۆڵەمێشیدام کـه لـەو خەونـەدا تارماییه نامۆکان سەر دەردێنن و مرۆڤەکانیان بۆ شوێنی سەرسوڕهێنەر تـر و سەیر تر ئەبرد.

پەنجەکانم بە شێوەیەکی تووڕە کلیلەکەیان لەمس ئەکرد.

لەگەڵ ئەو تەم مژەدا، بینینی کێوەکان له پەنجەرەی خانووەکەوە دژوار بـوو. بەدڵنیاییـەوە مـاڵ تاریـك بـوو ـــــ هـەتاوەتاو لـه نێـوان پەردەکانـەوە دەرنەدەکـەوت و تیـشکی نەئەهاویـشت. بـەبێ بـوونی ئـەو لـه کـەنارم، بەدڵنیاییەوە ماڵ غەمگین ئەبوو.

سەیری کاتژمێرم کرد. کاتژمێر نۆی بەیانی بوو.

ئەبوایه کارێکم بکردایه، کارێك که به تێپەڕ بوونی کات، لـه چـاوەڕوانیدا، هاوکاریم بکات.

چاوەڕوانی. ئەمه یەکەمین وانه بوو که سەبارەت به ئەویندآری فێری بووم. ڕۆژ هەر بەردەوامە، هەزار پیلان و نەخشه دادەڕێژی، هەزار گفتو گـۆی گونجـاوت به خەیاڵدا دێت، بەڵێن ئەدەیت که ڕەفتارت سەبارەت بـه مەسـایلی تاییـەت بگۆڕیت ـــ وه هەروەها بـێ قـەرار و بـێ ئـارامی، بـێ ئـارام، هـەتا وەکـو خۆشەویستەکەت بێت.

وه دوایی ئیتر نازانی چی بڵێیت. ئەو کاتـژمێری چـاوەڕوانیانه دەگۆڕێـت بـۆ جەستەیی، وه جەسته ئەگۆڕرێت به تـرس، وه تـرس ئەبێته هۆی ئەوەی که لـه دەربڕینی هەستەکانمان خەجاڵەت بکێشین.

گفتوگۆی ڕۆژی پێشووم بە بیر خۆم هێنایەوە: (نازانم، بچمە ژوورەوە یان نا ؟)ـــ ئەو ماڵە پیشاندەری خەونێك بوو.
بەڵام نەمدەتوانی تەواوی ڕۆژ لەوێدا بوەستم. شەهامەتم بە خەرج دا، کلیلەکەم لە گیرفانم هێنایە دەرەوە و ڕوو بە دەرگاکە ڕۆشتم.
ـــ (پیلار!)
ئاوازێك بە زمانی فەرەنسی، لە ناو تەم و مژەکەوە ئەهات. زیاتر تەعەجوبم ئەکرد تا سەر سوڕمان. لەوانەیە خاوەن ماڵەکە بێت کە ژوورمان لێ بە کری گرتبوو ـــ بەڵام لە یادم نییە کە ناوی خۆمم بە ئەو ووتبێت.
دووبارەی کردەوە: (پیلار!) وە ئەم جارەیان لە شوێنێکی نزیك ترەوە.
سەیری دەورو بەری مەیدانم کرد کە بە تەم و مژ دا پۆشرا بوو. یەك بە خێرایی نزیك ئەبوویەوە.
کابوسی تەم و مژ و تارمایی نامۆ خەریك بوو بە ڕاستیەوە پەیوەست ئەبوو.
ووتی: (پەلە مەکە. ئەمەوێ لەگەڵت بدوێم.)
کاتێ نزیك بوویەوە، بینیم کە قەشەیەکە. بە پەیکەر لە قەشەی لادێکان ئەچوو: باڵا کورت، کەمێك قەڵەو، چەند تەڵێك مووی سپی بەسەر سەری تاسیەوە بوو.
بە زەردەخەنەوە دەستی بۆ درێژ کردم و : (سەلام.)
گێژ بووم، بەڵام وەك ئەرکێك وەڵامم دایەوە.
سەیرێکی ماڵەکەی کرد: (بە داخەوە کە تەم و مژ هەموو لایەکی دا پۆشیوە. سەن ساوەن لە کێودایە و لەم ماڵەوە تێڕوانینێکی جوانی هەیە. ئەتوانیت لە پەنجەرەکانیەوە شیوەکان لە خوارەوە و (ساترە) ساترە سەهۆڵبەندانەکان لە سەرەوە ببینیت. هەڵبەتە خۆت ئەزانی.)
هەمان سات گومانم برد کێیە: قەشەی پەرستگایەك.

پرسیارم کرد: (تۆ لێره چی ده‌که‌ی ؟ ناوی من له کوێ ده‌زانی؟)
بابه‌ته‌که‌ی گۆڕی: (ئه‌ته‌وێ بچیته ژووره‌وه ؟)
ـــ (نه‌خێر. ئه‌مه‌وێ وه‌ڵامی پرسیاره‌که‌م بده‌یته‌وه.)
ده‌سته‌کانی به‌یه‌کدا دا تا که‌مێك گه‌رمیان بکاته‌وه، وه له‌سه‌ر شۆسته‌که دانیشت. له په‌نایدا دانیشتم. ته‌م و مژ سات به سات چڕ تر ئه‌بوویه‌وه و که‌نیسه‌که‌ی له ناو خۆیدا حه‌شار دابوو ـــ که‌نیسه‌که ته‌نها چه‌ند مه‌ترێك لێمانه‌وه دوور بوو.
ته‌نها ئه‌مانتوانی چاڵه‌که ببینین. که‌وتمه‌وه یادی ده‌سته‌واژه‌کانی ئه‌و ژنه.
ووتم: (ئه‌و ئاماده‌یه، له‌وێیه.)
ـــ (کێ ؟)
وه‌ڵامم دایه‌وه: (مریه‌می موقه‌ده‌س. ئه‌و هه‌ر ئه‌و ته‌م و مژه‌یه.)
پێکه‌نی: (که‌وایه سه‌باره‌ت به‌م بابه‌ته له‌گه‌ڵت دواوه! باشه، پێت ڕاده‌گه‌یه‌نم که ئه‌و به کچه مریه‌م ناو ببه‌ی. شیاو تره.)
دووباره‌م کرده‌وه: (تۆ لێره چی ده‌که‌ی ؟ ناوی من له کوێ ئه‌زانی؟)
ـــ (هاتم، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی وویستم ئێوه دوو ئه‌فه‌ر ببینم. که‌سێك که دوێنێ شه‌و له کۆمه‌ڵی ڕێزداره‌کان بوو، پێی ووتم که تۆ له سه‌ن ساوه‌ندایت. وه ئێره شارێکی زۆر بچووکه.)
ـــ (ئه‌و هاتووه‌ته په‌رستگاوه.)
له پێکه‌نین که‌وت، سه‌ری به‌م لاو لادا ئه‌برد.
وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ خۆیدا بدوێت: (به داخه‌وه.)
ـــ (به‌داخه‌وه که چووه‌ته په‌رستگاوه؟)
ـــ (نه‌خێر، له‌وێ نییه. هه‌ر ئێستا من له‌وێوه هاتم.)

تا چەند خولەکێك نەمدەزانی چی بڵێم. دووبارە هەستەکانم بە بیر خۆم هێنایەوە هەر ئەو هەستانەی کە لە خەو هەستام. پارە. پراکتیزە کردن. پەیوەندی کردن بە دایك و باوکمەوە. بلیت. بەڵام بەڵێنم دابوو، وە ئەبووایە بەوەفا بوومایە بۆ بەڵێنەکەم و کارم پێبکردایە.

قەشەیەك لە کەناری مندا بوو. لە منداڵیمدا خووم بەوەوە گرتبوو کە هەموو شتێکم بۆ قەشەکان بگێڕمەوە.

بێدەنگیم شکاند و ووتم: ( ماندووم. تا هەفتەیەك لەمەوبەر، دەمزانی کە بوونم هەیە و چیم لە ژیان ئەوێ. ئێستا ئەڵێ ی کەوتوومەتە ناو گێژاوێکەوە و لەم لا بۆ ئەو لام ئەمبات و هیچم لە دەست نایەت. )

قەشەکە ووتی: ( بەرەنگاری بکە. گرنگە. )

لە ڕستەکەی سەرسام بووم.

وەك ئەوەی بیرۆکەکانمی خوێندبێتەوە، درێژەی پێدا: ( مەترسە. ئەوە بزانە کە کەنیسە پێویستی بە قەشەی تازە هەیە وە ئەو ئەبێتە قەشەیەکی پایە بەرز. بەڵام ئەو بەهاو نرخەی کە ئەبێت بیبەخشێت زۆر زۆرە. )

ـــ ( لە کوێیە؟ منی لێرە بە تەنها بە جێهێشتووە و ڕۆشتووە بۆ ئسپانیا؟ )

ـــ ( ئسپانیا؟ بڕوات بۆ ئسپانیا چی بکات ؟ ماڵەکەی پەرستگایە، لە چەند کیلۆ مەترێکەوە لێرە.

لێرە نییە، وە دەزانم لە کوێ دەتوانم بیدۆزمەوە. )

دەستەواژەکانی کەمێك شادی و شەهامەتی بە من بەخشی، بەلایەنی کەمەوە تەرکی نەکردبووم.

بەڵام قەشەکە ئیتر پێنەدەکەنی.

دووبارە بیرۆکەکانمی خوێندەوە و درێژەی دایە: ( خۆشحاڵ مەبە. بریا بۆ ئسپانیا گەڕابایەتەوە. )

قەشەكە لەوێدا هەستا و داواى لە من كرد كە لەگەڵيدا بڕۆم. تا چەند مەتريك زياترمان نەدەبينى، بەڵام بە ڕواڵەت دەيزانى ئەيەوێ بۆ كوێ بڕوا. لە هەمان ڕێگەوە لە سەن ساوەن چووينە دەرەوە كە دوو ڕۆژ لەمەوبەر ـــ يان پێنج ساڵ لەمەوپێش بوو؟ ـــ داستانى "برنادت" م لەوێدا بيست.

پرسيارم كرد: (بۆ كوێ دەڕۆين ؟)

وەڵامى دايەوە: (ئەڕۆين بيدۆزينەوە.)

لەكاتى ڕێكردندا ووتم: (ئەتەوێ من گێژ بكەيت. كاتێ ووتم لێرە نييە، خەمگين بوويت.)

ـــ (كچەكەم، تۆ لە ژيانى مەزهەبى چى دەزانى ؟)

ـــ (زۆر كەم دەزانم . ئەوە دەزانم كە قەشەيان سوێندى دەروێشانە و خۆ بە دەستەوەدان و وەفادارى دەخۆن.)

بيرم كردەوە درێژەى پێبدەم يان نا، بەڵام بڕيارمدا درێژەى بەمێ.

ـــ (وە سەبارەت بە تاوانى خەڵكى بڕيار نەدات، هەرچەندە پێدەچێ خۆشيان هەمان تاوان ئەنجام بدەن. وە وا دەزانن سەبارەت بە ئەوين و زەواج هەموو شتێك ئەزانن. وە ئێمە بە ئاگرى دۆزەخ دەترسێنن، بە هۆى ئەو هەڵانەوە كە خۆيان دووچارى دەبن.

وە خودا وەكو بونێكى كينە لە دڵ بە ئێمە پيشان ئەدەن، كە مرۆڤەكان بە كەمتەرخەم دەزانێت لە مردنى تەنها كوڕەكەى.)

قەشەكە پێكەنى: (تۆ زۆر بە باشى پەروەردەى دەستى كاسۆليكى بەڵام من سەبارەت بە مەزهەبى كاسۆليك ناپرسم. سەبارەت بە ژيانى ڕۆحانى پرسيارم كرد.)

هيچ كاردانەوەيەكم پيشان نەدا.

سه‌رئه‌نجام ووتم: ( نازانم ڕاسته يان نا. كه‌سانێك هه‌ن كه هه‌موو شتێك ئه‌خه‌نه ئه‌و لاوه و به دواى خودادا ده‌كه‌ونه ڕێ. )

ـــ ( وه په‌يداشى ئه‌كه‌ن ؟ )

ـــ ( تۆ وه‌لامه‌كه‌ى ده‌زانيت. من بۆچوونێكم نييه. )

قه‌شه‌كه له هه‌ناسه‌بڕكێى من به ئاگا بوو و هه‌نگاوه‌كانى هێواش كرده‌وه.

ـــ ( سه‌ر تا پا له هه‌ڵه‌داى. كه‌سێك كه به دواى خودادا ده‌ڕوات، كاتى خۆى به فێڕۆ ئه‌دات. ده‌توانێت ڕێگايه‌كى زۆر بگرێته به‌ر، وه په‌نا بباته به‌ر ديانه‌ته‌كان و گروپه‌كانى تر، به‌لام به‌م شێوه‌يه هه‌رگيز ئه‌و نادۆزێته‌وه.

خوداوه‌ند لێره‌دايه، ئێستا، له كه‌نارى ئێمه. ده‌توانين ئه‌و له ناو ئه‌م ته‌م و مژه، له‌م زه‌ويه، له‌م جل و به‌رگانه‌دا ببينين. كاتێ ده‌خه‌وين، فريشته‌كان بالده‌گرنه‌وه و كاتێ كار ده‌كه‌ين، هاوكاريمان ده‌كه‌ن. بۆ دۆزينه‌وه‌ى خودا، ئه‌وه‌نده به‌سه كه سه‌رنجێكى ده‌ور و به‌رمان بده‌ين.

ئه‌م ديداره ئاسان نييه. له كاتێكدا كه خودا ئێمه به ئاگا ئه‌هێنێ بۆ به‌شدارى كردن له ڕاز و نهێنيه‌كانى خۆيدا، هه‌ست به سه‌رگه‌ردانى ده‌كه‌ين. له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌و هه‌ميشه داوا له ئێمه ده‌كات به دواى خه‌ونه‌كان و دلى خۆماندا بڕۆين. ئه‌م كاره دژواره، چونكه به شێوه‌يه‌كى تر خوومان به ژيانه‌وه گرتووه.

وه به‌و په‌ڕى سه‌رساميه‌وه تێده‌گه‌ين كه خوداوه‌ند حه‌ز ده‌كات ئێمه به شادمانى ببينێت، چونكه ئه‌و باوكه. )

ووتم: ( وه دايك. )

تەم و مژەکە کەم کەم ئەڕەوییەوە. دەمتوانی ماڵێکی لادێیی بچووك ببینم کە ژنێك لە بەردەمیدا چیلکە داری کۆ ئەکردەوە.

ــــ (بەڵێ، وە دایك. هەبوونی ژیانێکی ڕۆحانی پەیوەندی بە چوونە ناو پەرستگاوە نییە، پەیوەندی بە ڕۆژو گرتن و ڕەنج کێشان و داوێن پاکیشەوە نییە.

تەنها ئەوەندە بەسە کە باوەڕت بە خودا هەبێت. لەوە بە دواوە، هەموو کەسێك ڕێگەی خودا دەگرێتە بەر و دەتوانێت ئاوێتەی سەیر و سەمەرەکانی خودا بێت.)

گفتوگۆکەیم پێ بڕی: (سەبارەت بە تۆ لەگەڵ مندا دواوە و هەموو ئەم شتانەی پێ ووتووم.)

قەشەکە وەڵامی دایەوە: (ئومێدەوارم خەلأت و بەردەوامیەکانی ئەوت قبوڵ کردبێت. چونکە لە دیدگای مێژووەوە، هەمیشە بەم شێوەیە نییە.

"Osiris" * لە میصر تێکشکاند. خودایانی یۆنانی لە پێناو ژنان و پیاوانی سەر ڕووی زەوی لەگەڵ یەکدا بە شەڕ هاتن.

"ئازتەکەکان*" Quetzalcoatl یان شار بەدەر کرد. ئاگریان لە خودایانی وایکینگەکان بەردا لە پێناوی ژنێکی Valhalla. عیسا لە خاچ درا.

بۆچی ؟)

وەڵامەکەیم نەدەزانی.

ــــ (لەبەر ئەوەی خوداوەند هاتە سەر ڕووی زەوی تا توانای خۆمانمان پێ پیشان بدات. ئێمە بەشێکین لە خەونەکانی ئەو وە ئەو خەونی شاد ئامێزی ئەوێت. هەر لەبەر ئەمە، ئەگەر ڕازی بین بەوەی کە خودا ئێمەی بە شادی

دروست كردووه، دەبێ وایدابنێین كه هەر شتێك پەل كێشمان ئەكات ڕوو بە خەفەت و تێكشكان، تاوانبار خۆمانین.

هەر لەبەر ئەمە، هەمیشە ئێمە خودا دەكوژین. لەسەر خاچ، یا لە نێو ئاگر، یان شار بە دەر كردن و دوورخستنەوەی، یا لە نێو دڵی خۆماندا.)

ـــ (بەڵام ئەوانەی كە لەو تێدەگەن....)

ـــ (ئەوانە گۆڕانكاری بەسەر دنیادا دێنن. بە نرخ و بەهایەكی زۆری قوربانی.)

ژنێك كە چیلكە داری كۆ ئەكردەوە، قەشەكەی بینی و بە ڕاكردن هات بۆ لامان. دەستی قەشەكەی ماچ كردو ووتی: (باوكە، مەمنونم! ئەو لاوە مێردەكەمی چارەسەر كرد!)

---

Osiris: گەورەترین خودای میصری باستان بووە.

ئازتەكەكان: خودای هونەرو كشتوكاڵ بووە لە ئەوەی ئەمەریكا.

قەشەكە هەنگاوەكانی خێرا تر كرد و ووتی: (ئەو مرۆڤەی كە چارەسەری كرد، كچە مریەم بوو. ئەو لاوە تەنها هۆكارێكە.)

ـــ (خۆی بوو. تكا ئەكەم تۆ فەرموو.)

لە هەمان ساتدا كەوتمە بیری شەوی پێشوو. لە كاتێكدا كە دەچووینە ناو كەنیسە مەزنەكەوە، پیاوێك شتێكی وەكو ئەمەی پێ ووتم كە:

(تۆ لەگەڵ پیاوێكدایت كە كاری سەیر و سەمەرە ئە نجام ئەدات!)

قەشەكە ووتی: (پەلەمانە.)

وەڵامم دایەوە: (نەخێر، پەلەمان نییە! خەریك بووم لە شەرمەزاری قسەكردنم بە فەرەنسیەكی دەست و پێ شكاو دەمردم ـــ كە زمانی من نەبوو: (سەرمامە و حەز ئەكەم قاوەیەك بخۆمەوە.)

ژنەکە دەستی گرتم و چووینە ژوورەوە. ماڵێکی ئارام بەخش بوو، بـەلام کـۆن بوو چاکسازی نەکرابۆوە، دیوارەکـانی بـەردین بـوون و سـەقفەکەی داریـن.
پیاوێکی شەست ساڵان لە بەردەم زۆپاکەیدا دانیشتبوو.
هەر ئەوەندەی کە قەشەکەی بینی، هەستا تا دەستی ماچ بکات.
قەشەکە ووتی: ( هەڵمەستە. هێشتا بە تەواوەتی باش نەبووی. )
وەڵامی دایەوە: ( دە کیلۆ زیـادم کـردووە، بـەلام هێـشتا نـاتوانم هاوکـاری خێزانەکەم بکەم. )
ــــ ( نیگەران مەبە. زۆر بە زوویی باشتر لە دڵت ئەبی. )
ژنەکە ووتی: ( ئەوم کاتێ بینـی کـە خـەریك بـوو بـە شـوێنی هەمیـشەییدا ئەڕۆشت. بەلام ئەمڕۆ سواری ئوتۆمۆبیل بوو. )
ژنەکە ووتی: ( باوکە، ئێمە پیرۆزکە. توانای ئەو.... )
قەشەکە ڕوونی کردەوە: ( توانای کچە مریەم.... )
ــــ ( توانای دایکی مریەم...، بەلام توانای تۆشی لەگەڵدایە، تۆ بوویـت کـە ئەوت هێنایە ئێرە. )
ئەم جارەیان باوك خۆی بە دوور گرت لە سەیرکردنی من.
ژنەکە جەختی کردەوە: ( دۆعا بکەن بۆ باوکم، باوك. )
قەشەکە هەناسەیەکی ساتری هەڵکێشاو بە پیاوەکەی ووت:
ــــ ( لە پێشی منەوە بوەستە. )
پیرە پیاوەکە گوێڕایەڵ بوو. قەشەکە چاوەکانی داخـست و ئـاوازێکی ماریـای خوێند.
دوا بە دوای ئەوە پەیوەست بوو بـە ڕوح القـدس "عیـسا" و داوای لێکـرد کـە یارمەتی ئەو پیاوە بدات.

له ناكاو ئاهـەنگى دەسـتەواژەكانى توند تـر بـوو. وەك بڵێـى نـزاى جنـى ئەخوێند، هەرچەندە ئیتر نەمدەتوانى بە تەواوى لە گفتەكانى بگەم. دەستى لەسەر شانى پیاوەكە دانا و دواى بەسەر دەستەكانیدا هاتە خوارەوە تا گەشتە ئاستى پەنجەكانى. چەندین جار ئەم جوڵەیەى دووبارە كردەوە.

دەنگە دەنگى ئاگرەكە لە ناو زۆپاكەدا بەرز بوویەوە، من و ژنەكە دەترسـاین. قەشەكە هیچ سەرنجى نەدا، نووقمى ڕیسالەكەى بوو ـــ بەو شـێوەیەى كـە پێـشتر ووتبـووى، هۆكـارى كـچە مریـەم بـوو. بـە زمـانێكى سـەیر ئـەدوا. دەستەواژەكان زۆر بە خێرایى لـە دەمـى ئەهاتنـە دەرەوە. دەسـتەكانى ئـیتر نەدەجولان ـــ لەسەر شانى پیرە پیاوەكەى بەردەمى نەدەجولا.

لەناكاو، مەراسیم بە هەمان خێرایى كە دەسـتى پێكردبـوو، كۆتـایى هـات. قەشەكە ڕووى وەرگێڕا و بە دەستى ڕاستى هێماى خاچێكى گەورەى كێشا.

ـــ (خودا هەمیشە لە نێو ئەم ماڵە بێت.)

وە ڕووى لە من كرد و داواى لێكردم كە درێژە بە ڕێگەكەمان بدەین.

ژنەكە هەر ئەوەندەى كە بینى ئێمە دەڕۆین، ووتى: (ئەى قاوەكە بوو بە چى ؟)

قەشەكە ووتى: (ئەگەر ئێستا قاوە بخۆم، خەوم لێ ناكەوێ.)

ژنەكە پێكەنى و لە ژێر لێوییەوە شتێكى وەهاى ووت (هێـشتا بەرەبەیانـە). نەمتوانى بە باشى ببیستم، چونكە ئێمە لە نێو شەقام بووین.

ـــ (باوك، ژنەكە سەبارەت بە لاوێك دوا كە مێردەكـەى چارەسـەر كـردووە. مەبەستى ئەو بوو.)

ـــ (بەڵێ ، ئەو بوو.)

هەستێكى خراپ لاى من دروست بوو. كەوتمە بیرى دوێنێ ، بە بیرى بیلباو، بە بیرى كۆنفرانسەكەى مەدرید، بە بیرى كەسـانێك كـە سـەبارەت بـە سـەیر و

سه‌مه‌ره‌ ده‌دوان، به‌ بیری بوونێك كه‌ كاتێـك ده‌ستم بـه‌ ده‌ستی كه‌سـانێكی نه‌رموه‌ بوو، هه‌ستم كرد.

وه‌ من ئه‌ویندارى پیاوێك بووم كه‌ ئه‌یتوانی كه‌سانێك ده‌رمان بكات. پیاوێـك كه‌ ئه‌یتوانی یارمه‌تی هاو شێوه‌كه‌ی بدات، له‌ ته‌نگ و چه‌ڵه‌مه‌ شـادی بـه‌دی بهێنێ، ته‌ندروستی بۆ نه‌خۆشان، وه‌ ئومێده‌واری بۆ ئازیزانی بگه‌ڕێنێته‌وه‌.

ووتی: ( كچم، هه‌ست مه‌كه‌ تاوانباری. )

ــــ ( تۆ بیرۆكه‌ی من ده‌خوێنیته‌وه‌. )

باوك ووتی: ( به‌ڵێ، ده‌یخوێنمه‌وه‌. منیش خه‌لاتانێكم هه‌یه‌ و هـه‌وڵ ئـه‌ده‌م شایسته‌یان بم. كچه‌ مریه‌م فێری كردم لـه‌ قـه‌ره‌باڵغی هه‌سـت و ئیحـساسی مرۆڤه‌كاندا به‌فداری بكه‌م تا بتوانم ئه‌وانـه‌ بـه‌ باشـترین شـێوه‌ ڕێنمـونی بكه‌م. )

ــــ ( تۆش سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ ئه‌كه‌یت. )

ــــ ( ناتوانم كه‌س ده‌رمان بكه‌م. به‌لام یه‌كێك له‌ خه‌لاتـه‌كانی ڕوح القدسـم هه‌یه‌. )

ــــ ( به‌س ئه‌توانی دڵی من بخوێنیته‌وه‌، باوك. وه‌ ده‌زانی كه‌ خۆشم ئـه‌وێ، وه‌ ئه‌م ئه‌وینه‌ سات له‌ دوای سات زیاتر ئه‌بێ. ئێمه‌ پێكـه‌وه‌ دنیـا گـه‌ڕاین و پێكه‌وه‌ش له‌ دنیادا ئه‌مێنینه‌وه‌. ئه‌و، ویستبێتی یا نه‌یوویستبێ، له‌ تـه‌واوی ڕۆژه‌كانی ژیانمدا بوونی هه‌بووه‌. )

ئه‌متوانی چی به‌و قه‌شه‌یه‌ بڵێم كه‌ له‌ ته‌نیشتمه‌وه‌ ڕێگه‌ی ده‌كرد؟ ئه‌و هه‌رگیز نه‌یده‌زانی كه‌ پیاوانی تریش له‌ ژیانی منـدا بـوون، بـه‌ر له‌مـه‌ش ئه‌وینـدار بووم، وه‌ ئه‌گه‌ر زه‌واجم ئه‌كرد، خۆشبه‌خت ئه‌بووم. هه‌تا له‌ منداڵیدا، ئه‌وینم دۆزییه‌وه‌ و فه‌رامۆشم كردبوو له‌ مه‌یدانێكدا له‌ سوریا.

بە ڕواڵەت فەرامۆش کردنی سەرکەوتوو نەبوو. تەنها سێ ڕۆژ بەس بوو تا هەموو شتێك بگەڕێتەوە شوێنی خۆی.

ـــ (باوکە، من مافی خۆمە خۆشبەخت بم. شتانێك کە لە دەستم دابوون، پەیدام کردنەوە، نامەوێ دووبارە لە دەستیان بدەمەوە. لە پێناوی خۆشبەختیمدا دەجەنگم.

ئەگەر ئەم هەوڵ و تەقەلایەم ناشیرین بکەیت، ئەوا ژیانی ڕۆحانی منیشت ناشیرین کردووە. هەر بەو شێوەیەی کە خۆتان ووتتان، ئەم کارە دوورخستنەوەی خودایە، دوورخستنەوە و تۆراندنی هێز و توانای ژنانەی منە.

باوکە، لە پێناویدا دەجەنگم.)

دەمزانی ئەو پیاوە کورتە باڵا و قەڵەوە لەوێدا چی دەکات. هاتبوو تا ڕازیم بکات کە تەرکی ئەو بکەم. لەبەر ئەوەی ئەو ئەرکێك و ڕسالەیەکی زۆر گەورەتری لە ئەستۆ بوو.

نەخێر، نەخێر نەمدەتوانی باوەڕ بەم داستانە بکەم کە ئەم قەشەیە لە تەنیشتمەوە دەڕۆشت، حەزی ئەکرد ئێمە زەواج بکەین و لە ماڵێکی وەکو ئەو ماڵەی سەن ساوەن پێکەوە بژین. قەشەکە ئەم شتانەی دەووت تا من فریوو بدات، بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆم بکەم، وە لە دوایدا بە پێکەنینێك، ڕازیم بکات بە کردارە پێچەوانەکانی.

بیرۆکەکانمی خوێندەوە و هیچی نەووت. پێدەچوو نەیویست فریوم بدات و نەیدەتوانی بیرۆکەی کەسانی تر بخوێنێتەوە. تەم و مژەکە بە خێرایی ڕادەماڵرا وە ئێستا ئەمتوانی شەقام و کوێستان، دەشت و درەختە داپۆشراوەکان بە بەفر ببینم. هەستەکانیشم ڕوونتر ئەبوونەوە.

نەفرەت لێکراو! ئەگەر ڕاستە و ئەم قەشەیە دەتوانێ بیرۆکەکانی من بخوێنێتەوە، باشترە هەموو شتێك بخوێنێتەوە و لە هەموو شتێك بگات.

بزانێت كه دوێنێ شه‌و ئه‌و ئه‌یوویست له‌گه‌ڵ مندا ئه‌وین بازی بكات، من نه‌مهێشت ـ وه په‌شیمان بووم.

دوێنێ بیرم ئه‌كرده‌وه كه ئه‌گه‌ر هه‌ر ئه‌بێت بڕوات، ده‌توانم بۆ هه‌میشه دۆستی ده‌ورانی منداڵیم له یاد بێت. به‌ڵام ئه‌م بیركردنه‌وه‌یه بێ هوده بوو. هه‌رچه‌نده ده‌ستی به من نه‌گه‌شتبوو، به‌ڵام هه‌ستێكی ساترا له ناخمدا ڕۆ چوو بوو وه گه‌شتبوو به دڵم.

دووباره‌م كرده‌وه: (باوكه، خۆشم ئه‌وێ.)

ـ (منیش خۆشم ئه‌وێ. ئه‌وین هه‌میشه ئه‌بێته هۆی بێ ئه‌قڵی. له باره‌ی منه‌وه، ناچارم هه‌وڵ بده‌م ئه‌و له چاره‌نوسی خۆی دوور بخه‌مه‌وه.)

ـــ (باوكه، دوورخستنه‌وه‌ی من كارێكی ئاسان نییه. دوێنێ، له كاتی ئزا كردندا له به‌رامبه‌ری ئه‌شكه‌وته‌كه، تێگه‌شتم كه منیش ئه‌توانم ئه‌و خه‌ڵاته، له خۆمدا ببینمه‌وه كه ئێوه باسی لێوه ئه‌كه‌ن. وه ئه‌مه‌وێ سوود وه‌ربگرم له‌و خه‌ڵاتانه بۆ ڕاگرتنی ئه‌و له كه‌ناری خۆمدا.)

باوك، به زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كه‌وه ووتی: (ئومێده‌وارم! ئومێده‌وارم سه‌ركه‌وتوو بیت.)

دوای وه‌ستاو ته‌سبیحێكی له گیرفانی هێنایه ده‌ره‌وه. ته‌سبیحه‌كه‌ی به ده‌سته‌وه گرت و به ساتری له چاوا ئمی ڕوانی.

ـــ (عیسا ووتوویه‌تی نابێ سوێند بخۆی، وه منیش سوێند ناخۆم. به‌ڵام له بوونی هه‌موو شتێك پیرۆزتره لام، به تۆ ده‌ڵێم كه نامه‌وێ ئه‌و ژیانێكی مه‌زهه‌بی ساده بگرێته به‌ر. نامه‌وێ به ناونیشانی قه‌شه‌یه‌ك سه‌ركه‌وتن به ده‌ست بێنێت.

ده‌توانێت به شێوازێكی تر خزمه‌ت به خودا بكات. له كه‌ناری تۆ.)

باوه‌ڕ كردنی دژوار بوو، به‌ڵام باوه‌ڕم كرد.

باوك ووتی: (لێرەیە.)

وەرگەڕام. دەمتوانی ئوتۆمۆبیلێك ببینم کە کەمێك لە پێشترەوە ڕایگرتبوو. هەمان ئەو ئوتۆمۆبیلەی کە لە ئسپانیاوە پێی هاتبووین.

بە پێکەنینەوە ووتی: (هەمیشە بە پێ دێت. ئەم جارە ئەیەوێت ئێمە ڕازی بکات کە لە کۆچێکی دوورەوە هاتووە.)

بەفر، پێلاوە کەتانیەکانی تەڕ کردبووم. بەلام قەشەکە پێلاوی کراوە و گۆرەوی ئاوریشمی لە پێ کردبوو، بڕیارمدا شکات نەکەم.

ئەگەر ئەو ئەیتوانی، منیش ئەمتوانی. بەسەر کێودا سەرکەوتین.

ـــ (دەبێ چەندە ڕێگە ببڕین؟)

ـــ (بە لایەنی کەمەوە نیو کاتژمێر.)

ـــ (بۆ کوێ ئەڕۆین؟)

ـــ (دەڕۆین ئەو ببینین. وە کەسانی تریش.)

تێگەشتم کە نایەوێت درێژە بە گفتوگۆ بدات. لەوانەیە پێویستی بە هێز و توانای خۆی هەبێت بۆ سەرکەوتن بەسەر کێودا. بە بێدەنگی دەڕۆشتین ـــ ئێستا تەم و مژ بە نزیکەیی ڕەواوەتەوە، وە تیشکی زەردی هەتاو کەم کەم دەردەکەوێت.

بۆ یەکەمین جار، دەمتوانی بە تەواوەتی شیوەکە ببینم، ڕووبارێك لە ناو شیوەکەدا دەرکەوت، چەند کەسێك لە دەورو بەری بوون، وە سەن ساوەن وەك بڵێی لەسەر شیوی کێوەکان نەخشێنرا بوو. گومەزی کەنیسەکەم بینی، وە گۆڕستانێکیش کە لەمەو بەر هیچ کات نەمبینی بوو، وە کۆمەڵە ماڵێکی سەدەی ناوەڕاست لە نزیك ڕووبارەکە.

کەمێك لە خوارو ئێمەوە، لە شوێنێك کە پێشتر لێوەی تێپەڕ بووبووین، شوانێك مەڕو مالاتی دەلەوەڕاند.

قه‌شه‌كه ووتی: ( ماندوو بووم. كه‌مێك پشوو بده‌ین. )

به‌فرمان له‌سه‌ر به‌ردێك لابرد و له‌سه‌ر به‌رده‌كه دانیشتین. قه‌شه‌كه ئاره‌قی ده‌رده‌دا و پێیه‌كانی به‌ستبووی.

ڕووی له من كرد و ووتی: ( سانتیاگۆ هێز و توانایم بپارێزه. چونكه ئه‌مه‌وێ جارێكی تر ڕێگه‌كه ببڕمه‌وه. )

له مه‌به‌ستی نه‌گه‌شتم بڕیارمدا بابه‌ته‌كه بگۆڕم.

ووتم: ( شوێن پێی چه‌ند نه‌فه‌رێك له‌سه‌ر به‌فره‌كه دیاره. )

ـــ ( هه‌ندێ له‌وانه ڕاوچین. هه‌ندێكی تریشیان ژن و پیاوانێكن كه ئه‌یانه‌وێت سونه‌تێك زیندوو بكه‌نه‌وه. )

ـــ ( چ سونه‌تێك؟ )

ـــ ( هه‌مان سونه‌تی ساوه‌نی قه‌دیس. دنیا ته‌رك بكه‌ن، بێن بۆ ئه‌م كێوانه، له ترسی خودا ڕۆیچن. )

ـــ ( باوكه، ئه‌بێ شتێك بزانم. تا دوێنێ، له‌گه‌ڵ پیاوێكدا بووم كه گومانی هه‌بوو زه‌واج بكات یا په‌نا به‌رێته به‌ر ژیانی مه‌زهه‌بی. ئه‌مڕۆ بۆم ده‌ركه‌وت كه هه‌ر ئه‌و پیاوه ده‌ست به سه‌یر و سه‌مه‌ره ده‌كات. )

قه‌شه‌كه ووتی: ( هه‌موو یه‌كێ له ئێمه سه‌یر و سه‌مه‌ره ده‌كه‌ین. عیسا فه‌رمووی: "ئه‌گه‌ر به قه‌ده‌ر دانه‌یه‌ك تۆوی خه‌رده‌ل ئیما نمان هه‌بێت، به‌و كێوانه ده‌ڵێن شوێنی خۆتان بگۆڕن! وه كێوه‌كانیش شوێنی خۆیان ئاڵوگۆڕ ئه‌كه‌ن." )

ـــ ( وانه‌ی خودایم ناوێ باوكه. من پیاوێكم خۆش ئه‌وێ و ئه‌مه‌وێ سه‌باره‌ت به ئه‌و زیاتر بزانم، یارمه‌تی بده‌م. بۆم گرنگ نییه كه هه‌موو مرۆڤه‌كان ئه‌توانن چی بكه‌ن. )

قەشەکە هەناسەیەکی ساتری هەڵکێشا. ساتێك مات بوو، بەڵام لە دوایدا دەستی پێکرد:

ـــ (لە یەکێ لە دورگەکانی ئەندەلوسیا، زانایەك کە لێکۆڵینەوەی لەسەر مەیمونەکان ئەکرد، توانی مەیمونێك فێری ئەوە بکات بەر لەوەی مۆزەکە بخوات، لە ناو ئاوی ڕووباردا بیشوات. میوە کاتێك لە قوڕ و پیسی پاك دەبوویەوە، چێژێکی باشتری ئەبوو.

زاناکە ئەم کارەی لە پێناوی نوسینی ڕیپۆرتاژێك کردبوو سەبارەت بە گرنگی لە بواری فێرکردن، وە پێش تر نەیدەتوانی پێش بینی دەرئە نجامی ئەم کارە بکات. کاتێ بینی مەیمونەکانی دورگە هەمان کاریان دووبارە کردەوە، سەرسام بوو.

تا وای لێهات، لە ڕۆژێکی خۆشدا، کاتێ برێکی دیاری کراو لە مەیمونەکان فێری ئەوە بوون کە مۆزەکانیان بشۆرن، مەیمونەکانی تریش لاساییان ئەکردنەوە. سەرسوڕهێنەر بوو، چونکە مەیمونەکانی دەورو بەری دورگە هیچ پەیوەندیەکیان بە مەیمونەکانی دورگەوە نەبوو کە ئەو لەوێدا تاقیکردنەوەی بە ئە نجام گەیاندبوو.)

بێ دەنگ بوو.

ـــ (تێگەیشتی ؟)

وەڵامم دایەوە: (نەخێر.)

ـــ (لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە لە دوای لێکۆڵینەوە دەکرا. سەرەکی ترینیان ئەوە بوو کە کاتێ کۆمەڵێکی تایبەت لە خەڵکی تۆکمە ئەبن، تەواوی مرۆڤەکان تۆکمە ئەبن. نازانم ئەم کارە چەند کەسی ئەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئاوایە.)

ووتم : ( وه‌كو داستانی لقاح مقدس. ئه‌ویش له ناو دانایان و زانایاندا سه‌ری هه‌ڵدا وه هه‌روه‌ها له ناو لادێییه نه‌خوێنده‌واره‌كاندا. )

— ( جیهان ڕۆحی هه‌یه، وه ساتێك دێته پێش كه ئه‌م ڕۆحه له هه‌موو كه‌سێكدا و له هه‌موو شتێكدا، هاوكات تێكه‌ڵ به كار و كردار ئه‌بێت. )

— ( ڕۆحێكی ژنانه. )

پێكه‌نی، به‌ڵام نه‌مزانی مه‌به‌ستی له‌و پێكه‌نینه چی بوو.

— ( به هه‌ر هۆیه‌ك بوو، له بنه‌ڕه‌تدا لقاح مقدس په‌یوه‌ندی به دانایان و زانایانه‌وه نه‌بوو. هه‌شت ملیۆن نه‌فه‌ر به‌یان كردنی حاڵێكیان بۆ پاپ نوسی و داوایان لێ كرد كه په‌سه‌ندی بكات. واژوكه‌ره‌كان له هه‌موو شوێنێكی دنیاوه هاتبوون. ئه‌م حاڵه‌ته ( ده‌رخستنه ) له گه‌ردوندا هه‌بوو. )

— ( باوكه، ئه‌مه یه‌كه‌مین هه‌نگاوه. )

— ( یه‌كه‌مین هه‌نگاوی چی؟ )

— ( ڕێگه‌یه‌ك كه ئه‌بێته هۆی ناسینی خانمان وه‌كو ده‌روه‌شاوه‌یه‌كی ڕووخساری مێینه‌ی خودا. هه‌ر چی بێت، پێشتر ڕازی بووین كه عیسا ده‌رخسته‌ی شێوه‌ی ئه‌وه. )

— ( مه‌به‌ستت چییه؟ )

— ( هه‌رچه‌نده درێژه ده‌كێشێت تا به لقاح مقدس ڕازی ببین كه ژنێك له‌ودا بوونی هه‌یه؟ روح القدس، دایك وه كوڕ. )

ووتی : ( با به ڕێ كه‌وین. هه‌وا زۆر ساردتر له‌وه‌یه كه لێره بمێنینه‌وه. )

ووتی: ( ماوەیەك لەمەوبەر، سەرنجی ئەعلەكانت دام . )

پرسیارم كرد: ( تۆ ئەم شێوە بیركردنەوانەش دەخوێنیتەوە؟ )

وەلامی نەدایەوە.

ووتی: ( ئەمەوێ هەندێ لەسەر گوزەشتەی بنیادنەری كۆمەڵەی مەزهەبیمان بۆ تۆ باس بكەم.

"ترزا" ئافرەتێكی جوان بوو . باوكی ناردیە پەرستگاوە تاخوێندنی نزاكان فێر بێت. ڕۆژێكیان كاتێك لەڕاڕەوێكدا تێپەڕ دەبوو، دەستی كرد بەگفتوگۆ كردن لەگەڵ عیسادا . خەڵوەتگەكەی ئەوەندە بەهێزو ساتر بوو بەتەواوی ڕۆچوو بوو لەو خەڵوەتەدا و لەماوەیەكی كورتدا ،ژیانی بەتەواوی گۆڕدرا .كاتێ بینی پەرستگاكانی (كرملی) گۆڕاون بۆبنكەی زەواج ، بڕیاردا گروپێك بنیاد بنێ كە پەیڕەوی لە فەرمانەكانی عیسا و كرملی بكەن .

"ترزا" ناچار بوو بەسەر خۆیدا زاڵ بێت بەو پەڕی توانەیەوە ڕووبەڕوی خۆی ببێتەوە. كەنیسەو فەرمانڕەوا . لە گەڵ هەموو ئەمانەدا باوەڕی وابوو كە ئەبێ ڕیسالەكەی بەئەنجام بگات .

ڕۆژێكیان ـــــــ لە كاتێكدا كەڕۆحی ترزا ڕوو بە لاوازی دەڕۆشت ـــ ژنێكی كۆنە پۆش لە پشت ئەو ماڵەوە كە ئەوی تێدا دەژیا،دەركەوت. ئەیویست بەهەر شێوەیەك بووە لەگەڵ دایكی ڕۆحانیدا بدوێت . خاوەن ماڵەكە خێری پێكرد، بەڵام ئەو خێرەكەی ڕەد كردەوە : تەنها بەشێوەیەك ئەو ژنە لەوێ دەڕۆشت كە لەگەڵ "ترازا " گفتوگۆ بكات .

سێ ڕۆژ لە دەرەوەی ماڵ بە چاوەڕوانی مایەوە بەبێ خواردن و خواردنەوە .سەرئەنجام ، ترزا بەهۆی دڵسۆزی خۆیەوە ژنەكەی هێنایە ماڵەوە .

خاوەن ماڵەكە ووتی : "ئەخێر ،ئەو دێوانەیە ! "

"ترزا" وه‌لامی دایه‌وه: ( ئه‌گه‌ر گوێ بۆ ووته‌ی هه‌مووان ڕادێرم، تێده‌گه‌م ئـه‌و كه‌سه‌ی كه دێوانه‌یه خۆمم. له‌وانه‌یه ئه‌م ژنه هـه‌مان جنـونی منـی هـه‌بێت: جنونی عیسا له‌به‌رزایی خاچ . )

ووتم : ( ترزای قه‌دیس له‌گه‌ڵ مه‌سیحدا قسه‌ی ئه‌كرد؟ )

وه‌لامی دایه‌وه: ( به‌ڵێ. به‌لام بابگه‌ڕێنه‌وه سه‌ر باسه‌كه‌مان.هه‌ر چی بوو، ئـه‌و ژنـه‌ی ڕازی كـرد .ووتـی نـاوی ( ماریـا )( Maria de Jesus ) خـه‌ڵكی ( Granada ) یه .قه‌شه‌یكی كرملی بوو وه كچه مریه‌م لـه‌ودا ده‌ركـه‌وتبوو وه داوای لێ كردبوو په‌رستگایه‌ك دروست بكات بۆ پاراستنی بنه‌ره‌تی سه‌ره‌تـایی ئه‌م گرووپه . )

بیرم كرده‌وه : ( هه‌ر وه‌كو ترزای قدیس ).

ـــــ ( ماریا هـه‌مان ڕۆژ په‌رسـتگاكه‌ی بـه‌جێ هێـشت , تـاڕۆم ڕۆشـتبوو .سه‌ردانه‌كه‌ی دوو ساڵ درێژه‌ی كێشا ، له هه‌وایه‌كی ئازاددا ده‌خه‌وت، سه‌رمای ده‌بوو، گه‌رمای ده‌بوو ، وه ڕۆژه‌كانی به یارمه‌تیدانی خـه‌ڵكی به‌سـه‌ر ئـه‌برد. به‌لام سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ی گه‌وره‌تر ئه‌وه بـوو پیـوی چـواره‌م ( Pio IV ) ئـه‌وی برده لای خۆی . له‌به‌ر ئه‌وه پاپش وه‌كـو تـرزاو كه‌سـانێكی زۆری كـه. بـیری له‌هه‌مان بابه‌ت ئه‌كرده‌وه ).هه‌ربه‌هه‌مان شێوه كه‌برنادت له بڕیـاردانی بـێ ئاگابوو،هه‌ر به‌هه‌مان شێوه‌ی مه یموونه‌كانی دورگه ئیتر نه‌یان ئـه‌توانی لـه ئه‌زمونێك كه‌له كاتی ڕوودانـدا بوو هه‌واڵیان هه‌بێت ،هه‌ر به‌و شـێوه‌یه‌ی كـه ماریا و ترزا نه‌یانده‌زانی كه‌سـێكی تـر بـیر لـه چـی ده‌كاتـه‌وه .كـه‌م كـه‌م له‌شتانێك تێگه‌شتم .

ئێستا گەشتووینەتە جەنگەڵێك . لقە بەرزەکانی درەختە ووشکەکان بە بەفر داپۆشرابوو ، یەکەمین پرژۆڵەی هەتاویان بەرئەکەوت .تەم ومژ لە ناو چوو بوو.

ـــــ ( باوکە ، دەزانم ئەتەوێ چ لە نجامێك بە دەست بێنی . )

ـــــ ( بەڵێ. جیهانی لەساتێکدا بەسەر ئەچێ . کەخەڵکانێکی زۆر فەرمانی یەکسانی بەدەست دێنن : بەدوای خەونەکانتاندا بڕۆن ، ژیان بە ڕێگەیەك بگۆڕنەوە کە دەتان گەیەنێتە لای خوداوەند. سەیر و سەمەرەکانی خۆتان ببەخشن . چارەسەری خەڵکی بکەن. پێش بینی بکەن .گوێ ڕادێرن بۆ ئامۆژگاریەکانی فریشتەی پاسەوانتان .بەهرەمەندبن، وە بە بەهرەمەندی خۆتان شادمان بن. )

ـــــ ( دڵ بە دەریا بسپێرن. )

هەتاو هەموو شوێنێکی گرتبۆوە . بەفرەکان ئەدرەوشانەوە و وەها درەوشانەوەیەك کە چاوەکانمی ماندوو ئەکرد. لەهەمان کاتدا، وەك ئەوەی ڕستەی قەشەکەی تۆکمە ئەکرد.

ـــــ( وە هەموو ئەمانە چ پەیوەندیەکی بەئەوەوە هەیە ؟ )

ـــــ ( شێوەی قارەمانی ئەم داستانەت بۆ باس ئەکەم . بەڵام دەربارەی ڕۆحی ئەم قارەمانانە هیچ نازانی. )

هەڵوێستەیەکی درێژخایەنی کرد .

درێژەی پێدا : ( ڕەنج . شەهیدەکان لە ساتێکی گۆڕاودا دێنە دنیاوە . بەر لەوەی کە خەڵکی بتوانێت بە دوای خەونەکانیاندا بڕوات، خەڵکی ئەبێ خۆیان بکەن بە قوربانی. )

ـــــ ( باوکە ، کەنیسە جادوگەرەکانی سووتاند. )

ــــ ( بەڵێ .وە ڕۆمیش مەسیحیەکانی دەرخواردی شێرەکان ئەدا .کەسانێك کە لە ناو ئاگر یا لە مەیدانی ( Arena )ی ڕۆمــدا مــردن ، بــەخێرایی بە پلــەی بەرزو شکۆدار گەشتن ــــ بەم شێوەیە باشترە .

بەلام ئەمڕۆ بەهرەمەندان بە ئور بە شتێکی خراپتر لە مەرگی پڕ شانازی ئەو شەهیدانە ڕووبەڕوون. نهێنی ترزای قەدیسیش هەر ئەوە بوو ــــ کە زەجــری کێشا لە تەمەنی ماوەیدا . هەر ئەمــەش بەســەر منداڵــە شــادەکانی فاتیمــا ( Fatima )دا هات : ( Sacinta ) و ( Fransisca ) دوای چەند مانگێك مــردن ، ( Lucia ) چووە ناو پەرستگاوە و هەرگیز لێی نەهاتە دەرەوە . )

ــــ ( بەلام بۆ برنادت بەم شێوەیە نەبوو. )

ــــ ( بۆچی، ڕوویدا . ناچار بوو زیندان ، خەفەت ، بێ بایــەخی تەحــەمول بکات بە دڵنیاییەوە ئەو بۆی باس کردووی . بە دڵنیاییەوە ئەبێت دەستەواژەی کچە مریەمی بۆ گێڕابێتەوە . )

وەلامم دایەوە : ( چەند ووشەیەك. )

ــــ ( ڕستەکانی خانمان لە لۆرد ، لــە نیــوەی پەڕاوگــەدا شــوێنێك داگــیر دەکات، بەم پێیە، لە نێوان ئەم ڕستانەدا، کچە مریەم بە کچێکی شوانی ووت : (( بەڵێنی شادی ئەم جیهانە بە تۆ نادەم . )) بۆچی دەبێت یەکێك لە ڕســتە کورتەکانی خۆی بەتێرو تەسەلی تایبەت بکات بە برنادەوە ؟ چونکە دەیزانی ئەگەر بە ڕیسالەکەی ڕازی بێت ، چ ڕەنجێك لە چاوەڕوانیدا دەبێت . )

چاوم بڕییە هەتاو ، بەفر و درەختە بێ بەرگەکان .                    باوك ، درێژەی پێدا : ( ئەو یەکێکە لە هەڵگەڕاوەکان، دەتوانێت لەگەڵ خانماندا بدوێت. ئەگەر بتوانێت هێزو توانای خۆی بەکاربهێنێت ، ئەتوانێت یەکێك بێت لە پێشڕەوەکان، لە ڕابەرایەتی کردنی گۆڕانی ڕۆحانی جۆری مرۆڤــ. جیهانی لە ساتێکی زۆر گرنگدا بە سەر ئەبرد .

بەلام ئەگەر ئەم ڕێگەیە هەڵبژێریت، ڕەنجێکی زۆر دەکێشیٚ. پێش بینیەکانی پێش لە ڕوودان دەهاتنە دی. من ڕۆحی مرۆڤ باش دەناسم وە دەزانم چ شتێکی لە مێشکدایە.)

قەشەکە ڕووی لە من کرد و شانەکانی گرتم.

ووتی: (تکا ئەکەم. تکا ئەکەم ئەو لەو ڕەنج و تراژیدیایە بە دوور بگرە کە لە چاوەڕوانیدایە، بەرگەی ناگرێت.)

ـــ (باوکە، لە ئەوینت ئەگەم سەبارەت بە ئەو.)

سەری جوڵاند.

ـــ (نەخێر لە هیچ شتێك ناگەیت. تۆ هێشتا لەوە لاوتری کە بتوانی لە نەهامەتیەکانی ژیان بگەیت. تۆ لەم ئان و ساتەدا خۆت بە هەڵگەڕاوەیەك دەزانی. دەتەویٚ لەگەڵ ئەودا دنیا بگۆڕی. ڕێگا گەلێکی نویٚ بکەیتەوە، کارێك بکەی کە چیرۆکی ئەوینی تۆ ببێتە ئەفسانە و ئەوە لە دوای ئەوە بۆ یەکتری بگێڕنەوە. هێشتا وا دەزانی ئەوین دەتوانێت سەرکەوتوو بێت.)

ـــ (ئەوین ناتوانێت سەرکەوتوو بێت؟)

ـــ (بەڵیٚ، دەتوانێت. لە شوێنی خۆیدا دوای کۆتای هێنان بە مشت و مڕە ئاسمانییەکان.)

ـــ (خۆشم ئەویٚ. وە نامەویٚ پیرۆزی ئەوینم تا دوای تەواو بوونی بەرامبەرکیٚ ئاسمانیەکان پشت گویٚ بخەم.)

لە دووری ئەڕوانی و وەك بڵێی لەگەڵ خۆیدا کەوتبووەوە گفتوگۆ کردن، دەیووت: (لە کەناری ڕووباری بابل دانیشتین و گریاین.)

ووتم: (چەندە خەمناك!)

ـــ (ئەمانە یەکەمین هێڵی یەکێك لە سرود و هۆنراوەکانن کە لەگەڵ ئەیدا دەوترێن. سەبارەت بە (تبعید) ڕاگواستن ئەدوێت، سەبارەت بە کەسانێك کە

نه‌یانه‌وێت بگه‌نه سه‌ر زه‌وی به‌ڵێن پێدراو و نـاتوانن. وه ئـه‌م ڕاگواسـتنه‌ش ماوه‌یه‌کی زۆر ده‌خایه‌نێت. بۆ ڕێگری کردن له ڕه‌نجی که‌سێك کـه نه‌یـه‌وێت پێش له ئامانج بۆ به‌هه‌شت بگه‌ڕێته‌وه، چ کارێکم له ده‌ست دێت ؟ )

ـــ ( هیچ کارێك باوکه. به‌ڕاستی ناتوانیت هیچ کارێك بکه‌یت. )

قه‌شه‌که ووتی: ( لێرمدایه. )

بینیم. ده دوانزه مه‌تر دوور تر، له ناو به‌فردا چۆکی دادابوو. کراسی له‌بـه‌ردا نه‌بوو وه هه‌تا له دووره‌وه پێستیم ئه‌بینی که له سه‌رمادا سوور هه‌ڵگه‌ڕا بوو.

سه‌ری دانه‌واند بوو ده‌سته‌کانی به‌رز کردبۆوه بـۆ ئاسمـان. نـازانم بـه هـۆی مه‌راسیمه‌که‌ی دوێنێ شه‌وه‌وه بوو، یا به هۆی ئه‌و ئافره‌ته‌وه بـوو کـه چـیلکه داری کۆ ئه‌کرده‌وه، به‌ڵام هه‌ستم کرد سه‌یری که‌سێکی خاوه‌ن هێز و توانایه‌کی ڕۆحانی گه‌وره ئه‌که‌م. وه‌ها که‌سێك که له دنیادا وێنـه‌ی نـه‌بوو ـــ له‌گـه‌ڵ خوداوه‌ند و ڕۆحی ڕووناکی ئاسمانـدا ئـه‌ژیا. وه‌ك ئـه‌وه‌ی کـه درموشـانه‌وه‌ی به‌فره‌که‌ی ده‌ورو به‌ری ئه‌م تێڕوانینه‌ی به من به‌خشی بێ.

قه‌شه‌که ووتی: ( له‌م ئان و ساته‌دا، که‌سانێکی تریش لـه‌م حاڵه‌تـه‌دان. لـه حاڵه‌تی ستایشی به‌رده‌وامدان، له حاڵه‌تی په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ خوداوه‌ند و کچه مریه‌مدان. له حاڵه‌تی گـوێ ڕادێـران بـۆ فریـشته‌کان، قه‌دیـسه‌کان، پـێش بینیه‌کان، ڕسته پڕ له حیکمه‌تـه‌کان، وه هـه‌موو ئه‌مانـه ده‌به‌سـتێته‌وه بـه کۆمه‌ڵێکی بچوك له باوه‌ڕداران. تا به‌م شێوازه بۆ پێشه‌وه بڕۆین، هیچ کێشه و ئاسته‌نگێك نیه.

به‌ڵام ئه‌و نایه‌وێت هه‌ر لێرمدا بمێنێته‌وه. ده‌یه‌وێ دنیا بخاتـه ژێـر پـێی و بیرو باوه‌ڕی مه‌سیحیه‌ت بڵاو بکاته‌وه. که‌نیسه ئێستا ئه‌وی ناوێ. وه تـه‌واوی دنیا بۆ که‌سانێکه که ئه‌م بیرو باوه‌ڕه به‌یان ده‌که‌ن. )

ـــ ( وه گوڵێك بۆ گوڵباران کردنی که‌سانێك که له دوایدا دێن. )

ـــــ (بەڵێ. بەڵام لە بارەی ئەوەوە بەم شێوازە نیە.)
بۆ لای ئەو بەڕێ کەوت.
ـــــ (بۆ کوێ ئەڕۆی؟)
ـــــ (ئەڕۆم لەو خەڵوەتگایە دەربیینم. پێی بڵێم خۆشم وویستوویی. وە ئەم یەکگرتنە پیرۆز دەکەم. ئەمەوێ لێرەدا هەر ئەو کارە بکەم، شوێنێک کە بۆ ئەو پیرۆزە.)
وەکو کەسێک کە لە شتێك بترسێت، هەستم بە دڵ تێکچوون ئەکرد، بەڵام لەوە نەئەگەشتم کە ئەم ترسەم لە چیە.
ـــــ (ئەبێ بیر بکەمەوە باوکە. نازانم ئەم کارە ڕاستە یان نا.)
وەڵامی دایەوە: (ڕاست نیە. باوکانێکی زۆر لە بارەی منداڵەکانیانەوە هەڵە دەکەن، چونکە وا دەزانن ئەزانن چ شتێك بۆ منداڵەکانیان گرنگە. من باوکی نیم و دەزانم هەڵە ئەکەم. بەڵام ئەبێ چارەنوسم بە ئەنجام بگەیەنم.)
سات لە دوای سات پەرێشان تر ئەبووم.
ووتم: (با بێزاری نەکەین، ماوە بدەین مەبەستەکەی بە ئەنجام بگەیەنێت.)
ـــــ (نابێت لێرە بێت. ئەبێ لەگەڵ تۆدا بێت.)
ـــــ (لەوانەیە لەگەڵ کچە مریەمدا بدوێت.)
ـــــ (لەوانەیە. بە هەر شێوەیەك بێت دەبێ بڕۆین بۆ لای. ئەگەر من لەگەڵ تۆدا ببینێت، دەزانێ کە هەموو شتێکم بۆ باس کردوویی. لە مەبەستی من دەگات.)
جەختم لەسەر کردەوە: (ئەمڕۆ) ڕۆژی جەژنی لقاح مقدسە. بۆ ئەو ڕۆژێکی تایبەتە. دوێنێ شادییەکەیم لەبەردەم ئەشکەوتدا بینی.)
وەڵامی دایەوە: (لقاح مقدس بۆ هەموو یەکێ لە ئێمە گرنگە. بەڵام من ئێستا کەسێکم کە ئامەوێ سەبارەت بە مەسایلی ئاینی قسە بکەم. بڕۆین بۆ ئەوێ.)
ـــــ (بۆچی ئێستا بڕۆین باوکە؟ بۆچی لەم ئان و ساتەدا؟)

ـــ ( چونكه دەزانم خەريكه سەبارەت بە داهاتوو نەخشە دەكێشێت و بڕيار دەدات. وە پێدەچێت بڕيارێكى هەڵە بدات. )

گەڕامەوە بۆ دواوە و وويستم لەو ڕێگەيەوە كە هاتووم بگەڕێمەوە. قەشەكە ئاوڕى دايەوە.

ـــ ( ئەوە چى دەكەى؟ نابينى كە تۆ تاكە كەسێكى كە ئەتوانى ئەو دەرباز بكەيت؟ نازانى كە خۆشى ئەوێيت، وە لە پێناوى تۆدا هەموو شتەكانى تر دەخاتە ئەو لاوە؟ )

هەنگاوەكانم سات بە سات توندتر ئەبوو لەگەڵ مندا ڕێگە كردن دژوار بوو، بەم شێوەيەش خۆى گەياندە لام.

ووتى: ( لەم ساتەدا خەريكه ڕێگە هەڵدەبژێرێ! پێدەچێت كە بڕيار بدات واز لە تۆ بێنێت و بەجێت بێڵێ! بجەنگە لە پێناوى كەسێكدا كە خۆشت ئەوێ! )

بەلام ڕا نەدەوەستام. هەرچەندە دەمتوانى، توندتر دەڕۆشتم. دەمووويست كێوەكە بەجێبێڵم، وە باوكى ڕۆحانى، وە هەڵبژاردەكانيش. دەمزانى پياوێك لە پشتى سەرمەوە ڕا دەكات، بيرۆكەكانم دەخوێنێتەوە، وە دەزانێت هەموو هەوڵدانێك بۆ گەڕانەوەم بێ سوودە. بەم حاڵەوە جەختى دەكردەوە، گفتوگۆى ئەكرد، تا كۆتايى دەجەنگى.

سەرئەنجام گەشتينە بەردێك كە نيو كاتژمێر پێشتر لەسەرى دانيشتبووين. بە ماندوويەتى، لەسەر زەوى دانيشتم.

بيرم لە هيچ شتێك نەدەكردەوە. دەمووويست لێرە هەڵبێم، بوارم هەبێت بير بكەمەوە.قەشەكە چەند خولەكێك دواى من گەشت. ئەويش بەهۆى ئەو ڕاكردنەوە لە پێ كەوتبوو.

پرسيارى كرد: ( ئەو كێوانەى دەوروبەرت دەبينى؟ ئەوانە نزا ناكەن، خۆيان بوونەتە ستايشى خودا. چونكه شوێنى خۆيان لە دنيادا دۆزيوەتەوە و هەر

لەوێدا دەمێننەوە. ئەم کێوانە هەر لەوێدا بوون، بەر لەوەی کە مرۆڤ سـەیری ئاسمان بکات، بەر لەوەی کە دەنگی هاوار ببیستن، وە لە خۆی بپرسێت کـە چ کەسێك دروستی کردووە. دێینە دنیاوە، ڕەنج دەکێشین، دەمـرین، وە کێوەکـان هەر لەویدان.

ساتێك هەیە کە دەبێ تیایدا بیر بکەینــەوە کـە ئایــا ئـەم هـەموو هـەوڵ و تێکۆشانە زەحمەتەکەی دەهێنێت؟ بۆچی هەوڵ نەدەین وەکو ئەو کێوانــە بــین ـــــ هەتاواگر و کۆن وە لە شوێنی خۆیان؟ بۆچـی هـەموو شـتێك بـۆ گـۆڕینی مرۆڤێك ئابوت بکەین کە زۆر بە زوویی ئەوەی بیستویانە لە بیری دەکەن و بـە دوای داستانی نوێدا دەڕۆن؟ بۆچی بە چــاوەڕوانی نەمێنینــەوە تــا کۆمــەڵێکی تایبەت لە خەڵکی ـــــ وەکو مەیمونەکان فێر ببن، وە لە دوایدا، ئـەم کـردارە بە پێزانە بەبێ زەحمەت لە تەواوی دورگەکانی تردا پەرە دەسێنێت؟ )

ـــــ ( باوکە، ئێوە بەم شێوازە بیر دەکەنەوە؟ )

چەند ساتێك بەبێ دەنگی مایەوە.

ـــــ ( خەریکی بیرو بۆچونەکانم دەخوێنیتەوە؟ )

ـــــ ( نەخێر. بەڵام ئەگەر وا بیرت دەکردەوە، ژیانی مەزهەبیت هەڵنەبژارد. )

ووتی: ( زۆر جار هەوڵمدا چارەنوسی خۆم بـزانم وە نـەمتوانی. ڕازی بـوم کـە بەشێك بم لە سەربازی خوداوەند، وە تەنها کارێك کە کردبووم ئەوە بووە کـە بۆ خەڵکی ڕوون بکەمەوە بۆچی بەدبەختی، ئازار و بێ دادوەری بـوونی هەیـە. ئەوەم لە ئەوانە ئەوێ کە مەسیحیەکی باش بن، وە لــە مــن دەپرســن: ( چــۆن دەتوانین باوەڕ بە خودا بکەین کاتێ ئەم هەموو ڕەنجە لە دنیادا هەیە؟ )

وە هەوڵ نەدەم شتێك کە ڕوونکردنەوەی نیە، ڕوونی بکەمــەوە. هــەوڵ نــەدەم بڵێم کە بەرنامە گەلێك هەیە، وە نەبەردی لە نێوان فریشتەکاندا هەیــە، وە هەموو یەکێ لە ئێمە گیرۆدەی ئــەو نەبەردیــەین. هــەوڵ نــەدەم بڵــێم کاتــێ

ژمارەیەکی دیاری کراو لە مرۆڤەکان ئەوەندە باوەڕیان هەبێت کە بتوانن ئەم سیناریۆیە بگۆڕن. هیچ کارێك ناکەن. )

ووتم : ( وەکو ئەو کێوانە وان. جوانن. کەسێك کە ئەوانە ببینێت، ناتوانێت بیر لە گەورەیی دروستکەر ( خالق ) نەکاتەوە. ئەوانە بەڵگەی ئەوینی زیندوویی خوداوەندە لەگەڵ ئێمەدا، بەڵام چارەنوسی ئەم کێوانە تەنها ئەوەیە کە شایەتی بدەن.

وەکو ڕووبارەکان نین کە دەجوڵێن و دیمەن دەگۆڕن. )

ـــ ( بەڵێ. بەڵام بۆچی وەکو کێوەکان نەبن؟ )

ـــ ( لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە چارەنوسی کێوەکان زۆر ترسناك بێت. ناچارن هەمیشە یەك دیمەن بنوێنن. )

باوك هیچی نەووت.

درێژەم پێدا : ( هەوڵمدا کێو بم. هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا بێت. دەموویست کارێکی دەوڵەتی بگرمە دەست، زەواج بکەم، مەزهەبی باو باپیرانم فێری منداڵەکان بکەم، هەرچەندە ئیتر باوەڕم پێی نیە.

ئەمرۆ خەریکم بڕیار ئەدەم هەموو ئەوانە بخەمە ئەو لاوە، وە بە دوای پیاوێکدا بڕۆم کە خۆشم ئەوێ. باش بوو کە بڕیارمدا وەکو کێو نەبم، زۆر نامێنمەوە و بەرگە ناگرم. )

ـــ ( قسەی فەیلەسوفانە دەکەی. )

ـــ ( خۆشم سەرسام بووم. بەر لەوە تەنها ئەمتوانی سەبارەت بە دەورانی منداڵی بدوێم. )

لە جێگەی خۆم هەستام و درێژەم بە ڕێگەکەمدا ڕوو بە شیوی کێوەکان. فەشەکە ڕێزی لە بێدەنگییەکەم گرت و تا کاتێ گەشتینە سەر شەقام، هەوڵی نەدا لەگەڵمدا بدوێت.

دەستەکانیم گرت و ماچم کرد.

ـــ (ئەمەویٔ ماڵئاوایت لیٔ بکەم. بەلام ئەمەویٔ بڵێم کە لێت تێدەگەم، وە لە ئەوینی تۆش سەبارەت بە ئەو دەگەم.)

باوك زەردەخەنەیەکی کرد و دەستی بەسەرمدا هێنا.

ـــ (منیش لە ئەوینی تۆ ئەگەم سەبارەت بە ئەو.)

ئەو ڕۆژەم بە ڕێگە برین لە شیو و دۆڵدا بەسەر برد، بە بەفر یاریم دەکرد، ڕۆشتم بۆ شارێکی نزیك سەن ساوەن، لەفەیەکی جگەرم خوارد، سەیری یاری دوگۆڵی چەند منداڵێکی بچوکم کرد.

لە کەنیسەی لادێیەکی تردا، مۆمێکم داگیرساند. چاوەکانم داخست و ئەو نزایانەی کە دوێنیٔ شەو فێری بوو بووم، دەمووتنەوە. دوایی دەستم کرد بە ووتنی دەستەواژەی بیٔ واتا ـــ وە لە هەمان کاتدا چاوم بڕیبوە پەیکەری خاچێك کە لە پشت میحرابەکەوە بوو. کەم کەم خەریك بوو خەلاتی زمانەکان فێر ئەبووم. ئاسان تر لەوە بوو کە من گومانم ئەبرد.

لەوانەیە ووتنەوەی ئەو دەستەواژانەی کە لە ناوچەی ئێمەدا هیچ واتایەکیان نیە، بە شێتانە بێتە پێش چاو. بەلام ڕوح القدس خەریك بوو لەگەڵ ڕۆحمدا قسەی دەکرد و شتانێکی ئەووت کە پێویستم بە بیستنیان هەبوو.

کاتیٔ هەستم کرد بە گوێرەی پێویست پالاوتە بووم، چاوەکانم داخست و پاڕامەوە: (ئەی خانمی ئێمە، باوەڕم بۆ بگەڕێنەوە. کارێك بکە کە منیش هۆکاری ئیرادەی تۆ بم. بوارێکم بۆ بڕەخسێنە تا لە ڕێگەی ئەویندا خۆم رابێنم. چونکە ئەوین هەرگیز هیچ کەسێك لە خەونەکانی دوانا خات.

مۆڵەت بدە با لەگەڵ پیاوێکدا بم کە خۆشم ئەویٔ. مۆڵەت بدە ئەو هەر کارێك کە ئەبێت، ئەنجامی بدات.... لە کەناری من.)

کاتێ گەڕامەوە بۆ سەن ساوەن، نزیکی شەو بوو بووەوە. ئوتۆمۆبیلێك لە بەردەم ئەوماڵەدا کە ژوورێکمان لێ گرتبوو بە کرێ وەستا بوو.

هەر ئەوەندەی کە منی بینی، پرسیاری کرد: (لە کوێ بووی؟)

وەڵامم دایەوە: (ڕێگەم دەبڕی و دەپاڕامەوە.)

ـــ (چەند ساتێك ترسام ڕۆشتبی. تۆ بە بەهاترین شتێکی کە لە دنیادا هەمە.)

وەڵامم دایەوە: (هەروەها تۆش.)

لە لادێیەکی نزیك سەن مارتین ئونس ڕاوەستاین. لە کێوەکانی پیرنە تێپەڕین، بەهۆی باران و بەفرەوە ڕۆژی پێشوتر زیاتر لەوەی کە بیرمان لێنەکردەوە درێژەی کێشا.

لە ئوتۆمۆبیلەکە دابەزی و ووتی: (بزانین ئەتوانین خواردنگەیەکی کراوە بدۆزینەوە؟ خەریکم لە برسا ئەمرم.)

لە شوێنی خۆم نەجوڵام.

ڕووی لە من کردو جەختی کردەوە: (وەرە.)

ـــ (ئەمەوێ سەبارەت بە شتێك بپرسم. پرسیارێك کە کاتێ یەکتریمان بینی نەمپرسی.)

لە ناکاو جدی بوو. لە کاتی جدیدا پێکەنینم ئەهات.

ـــ (پرسیارێکی گرنگە؟)

هەوڵم دا بە شێوەیەکی جدی بکەومە بەر چاو: (زۆر گرنگ. پرسیارەکە ئەمەیە: خەریکین بۆ کوێ ئەڕۆین؟)

قاقا پێکەنین.

هەناسەیەی ڕاحەتی هەڵکێشا و ووتی: (Zaragoza.)

لە ئوتۆمۆبیلەکە دابەزین و ڕۆشتین تا خواردنگەیەکی کراوە پەیدا بکەین. لەو کاتەی شەودا، زۆر دژوار بوو پەیدا کردنی.

بەخۆمم ووت: (نەخێر، دژوار نيە. كەسەكەی تر "ڕۆحم" چيدی لەگـەڵ منـدا نيە. سەير و سەمەرە دژوارە.)

پرسيارم كرد: (ئەبێت كەی بگەيت بە بارسلون؟)

وەڵامی نەدايەوە. ڕووخساری دووبارە جدی بوو. بيرم كردەوە: (دەبێ لەم جـۆرە پرسيارانە خۆم بە دوور بگرم. لەوانەيە وا بزانێت ئەمەوێ ژيانی كۆنتڕۆڵ بكەم.)

كەمێك بە ڕێگادا ڕۆشـتين و هيـچمان نـەووت. لـە مەيـدانی لادێ تـابلۆيـەك دەدرەوشايەوە.

تەنها ووتی: (كراوەيە. بڕۆين شتێك بخۆين.)

بيبەری سوريان هەڵچنی بوو لە شێوەی ئەسـتێرە لەگـەڵ ماسـیدا. لـە پـاڵ ئەودا، پەنيريان بە پارچە پارچەی تەنك دانا بوو.

لە نـاوەڕاستی مێزدا، مۆمێك داگيرسا، پيكێكی بە نزيكەيی بەتـاڵ لـە شـەراب دانرا بوو.

لاوە خزمەتكارەكـە ووتـی: (ئێـرە شـوێنێكی هـەڵگرتنی شـەرابی سـەدەی ناوەڕاستە.)

لەو كاتەی شەودا، تەنها يەك دوو ئەفەرێك لە باڕدا بوون. ئەو هەسـتا، بـە دوای تەلەفۆندا ڕۆشت و دوايی گەڕايەوە. ووبستم بپرسـم تەلـەفۆنی بـۆ كـێ كردووە ـــ بەڵام ئەمجارە توانيم كۆنتڕۆڵی خۆم بكەم و نە پرسم.

ـــ (ئێمە تا كاتژمێر دوو نيوی بەيانی لـە خزمەتـداين. ئەگـەر بتانـەوێ، دەتوانم گۆشت، پەنير و شـەرابتان پێـشكەش بكـەم تـا لـە نێـو مەيدانـدا بينۆشن. كحول ڕێگە لە سەرما ئەگرێت.)

ووتی: (زۆر نامێنينەوە. دەبێ تا بەيانی بگەينە Zaragoza .)

پیاوەکە ڕۆشت بۆ پشتی مێزەکەی. پێکەکانمان دووباره پـڕ کـردەوە. دیـسان هەمان هەستی سوکی بیلباو هاتبوە لام ـــ هەر ئـەو مەسـتیە، یارمـەتیمان ئەدات ووتەی دژوار بڵێین و ببیستین.

دوای خواردنەوەی قومیکی تر، کەوتمە گفتوگۆ : ( تۆ له شۆفێری کردن ماندوو بوویت وە ئێمەش خەریکین دەخۆینەوە. باشتر وایـە لێـرە بمێنینـەوە، کاتـێ دەهاتین "Parador"* یکم بینی. )

بە سەر جوڵاندنێك پەسەندی کرد و تەنها ووتـی:

ـــ ( سەیری ئەم مێزەی بەردەممان بکە. یابانیەکان پێی ئەڵێن "Shibumi" : جوانکاری کردن لە شتی سادە و ساکار. بەڵام خەڵکی گیرفانیان پڕ لە پـارە ئەکەن، بۆ شوێنە گران بەهاکان ئەڕۆن، وە وا دەزانن جوان بوون. )

کەمێکی ترم خواردەوە.

"Parador" . شەوێکی تر لـە کـەناری ئـەودا.کـچێنی وەکـو ڕاز و نهێنیـەك دەگەڕایەوە.هەوڵم ئەدا بە شتێکی ترەوە خۆم سەرقاڵ بکەم: ( سەرسوڕهێنەرە کەفتەشەیك سەبارەت بە جوانی دەدوێت. )

ـــ ( بەڵام ئەمە لە پەرستگادا فێر بووم. هەرچەندە لە ڕێگـەی بـاوەڕەوە لـە خـودا نـزیکتر بینـەوە، سـادەتر دەبـین. هەرچـەندێك ئـەو سـادەتر بێـت، ئامادەبوونی بەهێزتر دەبێت. )

دەستی خستە سەر مێزەکە و هاتە پێشەوە.

ـــ ( مەسیح کاتێ لە بەرپرسیارییەکەی بە ئاگا بوو داری ئـەبڕی و کورسـی دروست ئەکرد.

---

* Parador : ساتری باستانی و بنەمای مێژووین کە دەوڵـەتی ئـسپانیا گـۆڕینی بـۆ میوانخانەی نمرە یەك.

وه‌كو دارتاشێك ناوبانگی ده‌ركردبوو، تا ئێمه فێری ئه‌وه بكات گرنگ نیه چ كارێك ده‌كات، هه‌ر كارێك ئه‌توانێت ئێمه پەلكێش بكات ڕوو به ئه‌زمونی ئه‌وینی خوداوه‌ند. )

له ناكاو هه‌ڵوێسته‌یه‌كی كرد.

ـــ ( نامه‌وێ له‌م باره‌وه قسه بكه‌م. ده‌مه‌وێ سه‌باره‌ت به ئه‌وینی كه‌سێكی تر قسه بكه‌م. )

به ده‌سته‌كانی له‌مسی ڕوخساری كردم.

شه‌راب هه‌موو شتێكی بۆ ئاسان تر كرد بوو، وه هه‌روه‌ها بۆ منیش.

ـــ ( بۆچی قسه‌كه‌ت بڕی؟ بۆچی ناته‌وێ ده‌رباره‌ی خودا، كچه مریه‌م، و دنیای ڕۆحانی بدوێیت؟ )

جه‌ختی كرده‌وه: ( ده‌مه‌وێ سه‌باره‌ت به ئه‌وینی كه‌سێكی تر قسه بكه‌م. هه‌مان ئه‌و ئه‌وینه‌ی كه ژن و پیاوێك گیرۆده‌ی ئه‌بن، وه له‌وه‌شدا ئه‌توانرێت سه‌یر و سه‌مه‌ره بكرێت. )

ده‌سته‌كانیم گرت، پێده‌چێت بیتوانیایه نهێنیه گه‌وره‌كانی خوای خانم بناسێت ـــ به‌ڵام ده‌رباره‌ی ئه‌وین هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی ده‌زانی كه من ئه‌مزانی.

ئه‌گه‌ر چی شوێنی زۆر گه‌ڕابوو.

ماوه‌یه‌كی زۆر ده‌ستی یه‌كتریمان گرت. له چاوانیدا ترسێكی زۆری كۆنه‌م ئه‌خوێنده‌وه كه ئه‌وینی واقعی وه‌كو ئه‌زمونێك ده‌یهێنێته سه‌ر ڕێگه‌ی مرۆڤ تا به سه‌ریاندا زاڵ بێت. یاداوه‌رییه‌كانی شه‌وی ڕابردووم خوێنده‌وه، ئه‌و یاداوه‌ریانه‌ی كه زه‌مانێكی زۆر دوور له یه‌ك بووین، ئه‌و ساڵانه‌ی له په‌رستگادا، گه‌ڕان به دوای جیهانێكدا كه ئه‌م ڕووداوانه‌ی تێدا ڕوو نادات.

له چاوانیدا خوێندمه‌وه كه هه‌زاران جار ده‌ركی به ئه‌م ساته كردووه، سیناریۆ گه‌لێكم خوێنده‌وه كه سابارەت به خۆمان دروستی كردبوو، ئارایشی زوڵفه‌كانم

و ڕەنگی جل و بەرگەکەم. دەمویست بڵێم "بەڵێ"، دەمویست بڵێم کە بە خێر هاتووە، کە دڵی من لە نەبەردیدا سەرکەووتوو بووە. دەمویست بڵێم چەندەم خۆش ئەوێ، لەم ئان و ساتەدا چەندە ئەوم ئەوێ.

بەڵام بە بێ دەنگی مامەوە. وەك ئەوەی لە خەونێکدا، ناکۆکیەکانیم بینیبێت. بینیم کە نیگەرانی ئەوەیە کە بڵێم "نەخێر"، دەترسێت لە دەستم بدات، دەترسێت دەستەواژەکانی ببیستێت کە لە ساتی چون یەکدا بیستوویەتی ــــ چونکە هەر یەکێ لە ئێمە تاقیمان کردۆتەوە و کاریگەری لەسەرمان بەجێهێشتووە.

چاوەکانی درەوشانەوە. دەمزانی خەریکە بەسەر تەواوی ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا زاڵ دەبێت.

دوای یەکێك لە دەستەکانی بەردام، پەرداخێکی هەڵگرت و لە کەناری مێزەکە داینا.

ووتی: (ئێستا دەکەوێت.)

ــــ (وایە. دەمەوێ بیخەیتە خوارەوە.)

ــــ (پەرداخەکە بشکێنم؟)

بەڵێ، پەرداخەکان بشکێنە. جوڵەیەکی بە ڕواڵەت سادە و ساکارە، بەڵام لێوان لێو لە ترسێك کە هەرگیز دەرکیان پێ ناکەین. شکانی پەرداخێکی هەرزان چ بایەخێکی هەیە، زۆر جار ئەم کارەمان کردووە؟

دووبارەی کردەوە: (پەرداخەکە بشکێنم؟ بۆچی؟)

وەڵامم دایەوە: (دەتوانم ڕوونکردنەوەیەکی تر بکەم. بەڵام لە ڕاستیدا تەنها لەبەر ئەوەی کە حەز ئەکەم بشکێت.)

ــــ (لەبەر خاتری تۆ بیشکێنم؟)

ــــ (هەڵبەتە کە نەخێر.)

سەیری پەرداخە شووشەینەکەی سەر مێزەکـەی کـرد ـــــ ئاگـاداری بـوو کـە نەکەوێت.

حەزم ئەکرد بڵێم: (ئەمە داب و نەریتی ڕێگایە. هەر بە هەمان شێوە کە خـۆت ووتت. قەدەغەیە. مرۆڤ شوشەیەك بـە ئەنقەسـت ناشـکێنێ. کاتـێ دەچـینە خواردنگەیەك یا لە ماڵی خۆماندا، بـەگام لـەوەی کـە پەرداخـەکان لەسـەر لێواری مێز دانەنرێن. جیهانی ئێمـە لـە ئێمـەی ئـەوێت کـە بـە ئاگـا بـین پەرداخەکان لەسەر مێز نەکەون. )

وە دیسانەوە بیرم کردەوە، بەس کاتێك بـە بـێ وویـستی خـۆت پەرداخەکـە دەشکێنیت، بە ئاگاین کە بابەتەکە زۆر جدی نەبێت. خزمەتکارەکـە دەڵێـت: (گرنگ نیە)، وە لە ژیانمدا هەرگیز نەمبینیوە پەرداخێك بخرێتە سەر حساب لە خواردنگەدا. شکانی پەرداخ بەشێکە لە ژیـان و زەرەر بـە ئێمـە و خـەڵکی ناگەیەنێت.

بە توندی بە مێزەکەمدا کێشا، پەرداخەکە جوڵا، بەڵام نەکەوتە خوارەوە.

بە شێوەیەکی خۆ نەوویستانە ووتی: (ئاگادار بە!)

جەختم کردەوە: (پەرداخەکە بشکێنە.)

بیرم کردەوە : (پەرداخەکە بشکێنە، چونکە جموجوڵێکی دیـارە . هـەوڵ بـدە تێبگەیت کە من لە نـاو دەرونمـدا شـتانێکی زۆر لـە پـەرداخ بـە بـەهاترم شکاندووە، وە لەو بارەیەوە خۆشحاڵم. سەیری نەبەردی دەرونـی خـۆت بکـە و پەرداخەکە بشکێنە.)

چونکە باپیرانمان فێریان کردووین کـە ئاگامـان لـە پەرداخـەکان بێـت، وە ئاگامان لە جەستەمان بێـت. فێـر بـوون کـە ئەوینـەکانی دەورانـی منـداڵی نەگونجاون، کە نابێت مرۆڤەکان لە بـە قەشـە بـوون دوور بخەینـەوە، کـە

مرۆڤەکان سەیر و سەمەرە ناکەن، کە هیچ کەس ناڕواتە کۆچێك کە نەزانێ بۆ کوێ دەڕوات.

تکا ئەکەم ئەو پەرداخە بشکێنە من لە پێش داوەرییە لەعنەتیەکان ڕزگار کە، لەم ڕوانگەیەوە ناچارین کارێك ئەنجام بدەین کە خەڵکی پەسەندی دەکەن.

جارێکی تر تکام کرد: (ئەو پەرداخە بشکێنە.)

چاوانی بڕییە چاوانمەوە. دوایی، بە هێواشی، دەستی برد بۆ پەرداخەکە. بە جوڵەیەکی خێرا خستیە خوارەوە.

دەنگی شکاندنی شووشەکە هەمووانی بە ئاگا هێنا. لە باتی ئەوەی بە هۆی شکانی پەرداخەکەوە حاڵەتێکی لێبوردەیی وەربگرێت، بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم ـــ و منیش زەردەخەنەیەکم کرد.

خزمەتکارەکە هاواری کرد: (گرنگ نیە.)

بەڵام ئەو گوێی پێنەدەدا. هەستا بووم، زوڵفەکانمی گرتبوو، وە ماچی ئەکردم.

منیش مووەکانیم گرتوو، بە تەواوی لە ئامێزم گرت. ماچێك بوو کە ماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕوانی بووم ـــ کە لەگەڵ دەریاکانی دەورانی منداڵیماندا هاتبوە دنیاوە، لە کاتێکدا کە هێشتا واتای ئەوینم نەدەزانی. ماچ گەلێك کە کاتێ گەورە بووین، ئاوێتەی هەوا بوو وە لە هەوادا مایەوە، کە لە پێناوی مەدالیایەکدا، سەر تا سەری دنیای پێوا، ماچێك کە چەندەها جار وون بوو وە ئێستا بەدەرکەوت. لەو ماچەدا، ساڵانێکی هەوڵدان، مەئنویسی، خەونە دژوارەکان شاراوە بوو.

بەو پەڕی بونمەوە ماچم کرد. بە دڵنیاییەوە کۆمەڵێکی کەم خەڵکی لەو بارەدا بوون، وە دەیانبینی، وە گومانیان نەبرد کە تەنها ماچێکیان بینیوە. نەیاندەزانی لەو ساتەدا، ئەو ماچە دەستەبەر کردنی ژیانی منە، دەستەبەر

کردنی ژیانی ئەوە، دەستەبەر کردنی ژیـانی هـەر کەسـێکە کـە ئومێـدەوارە، خەون ئەبینێت و لە ژێر ڕوناکی هەتاودا بە دوای ڕێگەی ژیاندا دەگەڕێت.
لەو یەك خولەك ماچەدا، تەواوی ساتە شادەکانی ژیانم بە بیرهاتەوە.
لەیەك ئالاین، لەگەڵ ترس، لە گەڵ ئارەزوودا. هەسـتم بـە دەرەێـك كـرد، بەلام گرنگ نەبوو. شتێك کە گرنگ نەبوو، چـێژ وەرگـرتن بـوو لـەو سـاتە.
دەستەکانم بەسەر سەریدا هێنا، گوێم بـۆ دەنگـی هەناسـەکانی ڕادێـرا، وە سوپاسی خودام کرد کە لێرەدایە، لە دەرونی مندا، وە بۆ یەکەم جارمە کە ئەم هەستە بە من ئەبەخشێت.
سەرانسەری شـەو هـۆگری ئـەوین بـووین ـــــ وە هـۆگری ئـەوین ئاهـەنگی خەونەکانی لەگەڵ بوو. هەستم بە ئـەو کـرد لـە دەرونمـدا، وە دڵدانـەوەیم ئەکرد تا دڵنیابم بە ڕاستی خەریکـە ڕووداوێـك ڕوودەدات، تـا نـەهێڵم لـە ناکاودا بڕوات ـــــ وەکو ئەو شا سوارانەی کە ڕۆژگارێك لەم سـاترە دێرینـەدا ژیانیان بەسەر ئەبرد.... کە ئێستا گۆڕاون بە میوا نخانەیەك.
بەڵێنم بە خۆم دا، بەلام ئەم بەلایە هەرگیز بەسەر مندا نەهاتبوو. هـەرگیز ئەو لە دەست نادەم. هەمیشە لەگەڵ من دەمێنێتەوە ـــــ چونکە من زمـانی روح القدسم بیستووە، سەیری خاچەکەم کرد لـە پـشت میحرابەکـەوە، و ئەوانـە ووتیان کە دووچاری تـاوانێك نـابم. لەگەڵیدا دەمێنمەوە، وە پێکەوە دنیـایەك دەستەمۆ ئەکەین کە ئەبێت دوویـارە دروست ببێت.
سەبارەت بە خودای خانم لەگەڵ یەکدا ئەدوێین، لە پەنـای مەلیکی میکاییـل دەجەنگین، ڕەنج و خەڵوەتی سوار چاکەکان پێکەوە ئەزمون ئەکەین. زمانەکان ئەمـەیان بـە مـن ووت ـــــ وە مـن ئیمـانم بـە دەسـت هێنایـەوە، دەزانم ڕاستیەکەیان ووتووە.

# پێنج شەممە

# 1993/12/9

کاتێ بەخەبەر هاتم، دەستی لەسەر سینەم بوو. هەوا ڕووناك بوو وە زەنگی کەنیسە هەر لەم نزیکانەدا هاتبووە دەنگ.

ماچی کردم. دەستەکانی جارێکی تر جەستەمی زیارەت کرد.

ووتی: (ئەبێت بڕۆین. ئەمڕۆ پشوو کۆتایی دێت، بە دڵنیاییەوە ترافیك هەیە.)

وەڵامم دایەوە: (نامەوێ بڕۆم بۆ "Zaragoza" . دەمەوێ بۆ هەر کوێ بڕۆیت لەگەڵت بێم. بە زوویی بانقەکان ئەکرێنەوە، دەتوانم بە کارتەکەم پارە وەربگرم و جل و بەرگ بکڕم.)

ـــــ (تۆ کە ووتت پارەیەکم نیە.)

ـــــ (کارێك ئەکەم. ئەبێ بەبێ داوای لێبوردن ڕابردووەکانم بشکێنم. ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ "Zaragoza" ، پێدەچێت وا بیربکەمەوە کارێکی بێ ئەقڵانە ئەنجام ئەدەم، کە تا تاقیکردنەوەکان شتێکی وەهای نەماوە، کە دەتوانین دوو مانگ لە یەکتر بەدوور بین تا تاقیکردنەوەکانم کۆتایی پێ بێت.

وە پێدەچێت نەمەوێ "Zaragoza" تەرك بکەم. نەخێر، نەخێر، ناتوانم بگەڕێمەوە. )

ئەبێت ئەو پردانە بشکێنم کە من دەبەستنەوە بەو ژنەی کە بووم.)

لە ژێر لێوەوە ووتی: (بارسلون.)

ـــــ (چی ؟)

ـــــ (هیچ. درێژە بە کۆچەکەمان ئەدەین.)

ـــــ (بەڵام تۆ ووتارێکت هەیە.)

وەڵامی دایەوە: ( هێشتا دوو ڕۆژم ماوە. ) دەنگی ئاوازێکی ئامۆی هەبوو: ( لە باتی کەسەکەی تردا ئەڕۆین. نامەوێ ڕاستەوخۆ بڕۆم بۆ بارسلون. )

هەستامە سەر پێ. نەمدەویست بیر لە ئاستەنگەکان بکەمەوە ـــ لەوانەیە بە هەمان هەست مرۆڤ لە دوای یەکەمین شەوی هۆگری ئەوین بەخەبەر هاتبووم: لەگەڵ شەرم و لەرزیندا.

ڕوو بە پەنجەرە ڕۆشتم. پەردەکەم لادا و سەیری شەقامێکی بچوکم کرد لە بەردەم پەنجەرەکە. جل و بەرگەکانیان لە هەیوانی ماڵەکاندا هەڵخستبوو تا ووشك ببنەوە. زەنگی کەنیسەکان لە دەرەوە دەنگی ئەدایەوە.

ووتم: ( بیرێکم بە خەیاڵدا هات. بڕۆین بۆ شوێنێك کە لە منداڵیدا ڕۆشت بووین. ئیتر هیچ کات ئەڕۆشتووم بۆ ئەوێ. )

ـــ ( کوێ ؟ )

ـــ ( پەرستگای پیدرا. )

کاتێ لە میوانخانەکە هاتینە دەرەوە، زەنگی کەنیسەکان هێشتا دەزرنگانەوە پێشنیاری کرد سەرێك لە کەنیسە بدەین.

وەڵامم دایەوە: ( ئێمە هیچ کارێکی ترمان نەکردووە. کەنیسە، دۆعا، مەراسیم. )

ووتی: ( ئەوینبازیشمان کردووە. سێ جار مەستمان کردووە. خێر و شەڕمان بە باشی یەکسان کردووە. )

قسەی بێ هودەم کردبوو. ئەبوایە خووم بە ژیانی جدیەوە بگرتایە.

ووتم: ( داوای لێبوردن ئەکەم. )

ـــ ( سەرێك لەوێ بدەین. دەنگی زەنگەکە تەنها ئاماژەیەکە. )

حەز لای ئەو بوو، بەڵام تەنها ڕۆژی دوایی لەو تێگەشتم. بەبێ ئەوەی لە واتای ئاماژەی شاراوە بگەم، سواری ئوتۆمۆبیل بووین و چوار کاتژمێر شۆفێریمان کرد تا کەنیسەی پیدرا.

سەقفەکە هاتبووە خوارەوە سەر ژمێراوی پەیکەری قەدیسەکان لەوێ ئەما بوو ـــ سەری هەموو ئەوانە.... جگە لە یەکێکیان.

سەیری دەور و بەرم کرد. لە ڕابردوودا، ئەم شوێنە بە دڵنیاییەوە خەڵکی بە توانا و لێهاتووی پەنا داوە کە ئاگادار بوون لە خراپ بوونی هەر پەیکەرێك وە کەسی بە توانایان لە چاکسازیدا خستوومەتە گەڕ.

بەڵام ئێستا بە وێرانە دێتە پێش چاوم. وێرانە گەلێك کە لە منداڵیدا، دەگۆڕران بۆ کۆمەڵە ساترەیەك کە لە ناویاندا پێکەوە یاریمان ئەکرد، وە لە ناویاندا ئەگەڕاین بە دوای شازادەی جوانیدا.

سەدەکان،قەشەکانی پەرستگای پیدرا ئەم بەشەیان لە بەهەشت بۆ خۆیان تەرخان کردبوو. لە چاڵێکی ڕۆچوودا جوغرافیایەك هەبوو وە لە شتێك کە لادێییەکانی دەورو بەری ناچار بە سواڵکردن دەبوون، بە فراوانی بەهرەمەند دەبوو: ئاو. ئێرە، پیدرا بە فشاری ئاو، جۆگە و دەریاچە دوابەدوایەکەکان دەگەشت و لەم لاو لایدا گژ و گیای جۆر بەجۆریان دەناشت.

لەگەڵ ئەم حاڵەدا. بەس بوو چەند سەد مەترێك بڕۆی تا لە شیو دەرچی و بگەیتە دەشت و بیابان. ڕووبارکە، کاتێ لە شیوەکە دەردەچوو، دووبارە دەگۆڕرێت بۆ جۆگەلەیەکی باریك. وەك بڵێی لەو ناوچەیەدا هەموو جوانی و هێزێکی سەرف کردبێ.

پیشەواکان ئەمەیان دەزانی لە بەرامبەر ئەوەی ئاویان بە دراوسێکان ئەدا، نرخێکی بێ بەهایان وەردەگرت. سەرگوزەشتەی پەرستگا لە جەنگی لە ژمارە نەهاتووی نێوان قەشەیان و لادێییەکان سەرچاوەی گرتبوو.

سەرئەنجام، لە یەکێ لە جەنگە دوا بەدوایەکەکاندا کە ئسپانیای هەژاند، پەرستگای پیدرا بوو بە سەربازخانەیەك. ئەسپەکان لە تەلارەکانی کەنیسەدا دەهاتن و دەچوون، وە سەربازەکانیش لەسەر پارچە فەرشەکاندا دەخەوتن، داستانی بێ شەرمانەیان دەووت و لەگەڵ ژنانی دراوسێدا ئەخەوتن.

ئاگری تۆڵە پەرەی سەند بوو ـــ هەرچەندە درەنگ. تەخت و تەراجی پەرستگا نابوت بوو.

پێشەواکان ئیتر نەیانتوانی ئەو بەهەشتە نوێ بکەنەوە. لە یەکێ لەو پڕوپاگەندە یاساییە دوابەدوایەکەکان لە دوای ڕووداوەکە، یەکێ ووتی کە ئەهلەکانی لادێی دەوروبەر یاساکانی خوداوەندیان بەجێ هێناوە. مەسیح ووتبووی: ( ئاو بدە، بە کەسێك کە تینووە. )، وە قەشەکانیش هیچ هەڵوێستێکیان بۆ ئەم بابەتە نەنواند. هەر لەبەر ئەمە، خوداوەند کەسانێکی لەناو برد کە خۆیان بە مالیکی سروشت دەزانی.

وە پێدەچێ هەر لەبەر ئەمە بوو کە هەرچەندە بەشێکی زۆر لە پەرستگاکان گۆڕان بۆ میوانخانە، کەنیسەی سەرەکی هێشتا وێران بوو. منداڵانی لادێ دراوسێکان هێشتا بەهایەکی قورسیان لە بیردا مابوو کە باوکیان ناچار بوون ببیەخشن تا شتێك بە دەست بێنن کە سروشت بە بێ بەرامبەر پێشکەشی ئەکات.

پرسیارم کرد: ( ئەو پەیکەرەی کە هێشتا سەری لەسەر جەستەیەتی کێیە؟ )

وەڵامی دایەوە: ( ترزای قەدیس ئاویلا. ئەو توانای هەیە. وە هەرچەندە جەنگەکان تینوی تۆڵە سەندنەوە بوون، هیچ کەس نەیوێرا دەست لەو بدات. )

دەستی گرتم و هاتینە دەرەوە. بە ڕاڕەوی گەورەی پەرستگادا تێپەڕین، بەسەر پلەکانە گەورە دارینەکاندا سەرکەوتین، وە سەیری پەپولەکانمان کرد کە لە

ناو باخچەیەكی دەرەوەدا بوون. تەواوی بەشەكانی ئەو پەرستگایەم لە بیردا مابوو ـــ چونكە لە منداڵیدا لەوێدا بووم، وە یاداوەرییە دێرینەكان زیندووتر لە یاداوەرییە تازەكانن.

یاداوەری. وەك ئەوەی مانگ و ڕۆژەكانی پێش ئەم هەفتەیە، پەیوەندیان بە ژیانێكی ترەوە هەبێت. دەورانێك كە هەرگیز ئەمدەویست بگەڕێمەوە بۆی، چونكە كاتژمێرەكانی بە دەستی ئەوین لەمس نەبوو بوون. هەستەم ئەكرد ساڵانێكە هەر ئەمڕۆ ژیاوم، بە هەمان شێوە بەخەبەر هاتم، هەمان كارم دووبارە كردەوە، وە هەمیشە هەمان خەونم هەبوو.

كەوتمە بیری دایك و باوكم، وە دایك و باوكی ئەوان، وە دایك و باوكی زۆرێك لە هاوڕێیانم. بە بیری خۆمم هێنایەوە كە چەندە كاتێكی زۆر بۆ بە دەست هێنانی شتێك جەنگاوم كە ئەمدەویست.

بۆچی ئەم كارەم كرد؟ ئەمدەتوانی ڕوونی بكەمەوە. لەوانەیە لەبەر ئەوە بوو كە تەمەڵ تر لەوە بووم كە بیر لە ڕێگا گەلێكی تر بكەمەوە. لەوانەیە لەبەر ئەوە بێ كە جیابوونەوە و دابڕان ئازارێكی زۆری ئەبوو. لەوانەیە لەبەر ئەوەی مرۆڤ پابەندە بە دووبارەكردنەوەی هەنگاوەكانی ئەوەكانی پێش خۆی، تا ئەو كاتەی كە ـــ كەوتمە بیری قەشە و مامۆستاكەم ـــ كۆمەڵێكی دیاری كراو لە خەڵكی دەست بە جۆرە ڕەفتارێكی تر بكەن.

دوایی، دنیا دەگۆڕرێت، وە ئێمەش لەگەڵیدا دەگۆڕرێین.

بەڵام ئیتر ئەمدەویست بەم شێوەیە بم. چارەنوس شتێك كە هی من بوو، بۆی گەڕاندبوومەوە وە ئێستا توانای گۆڕانی خۆمم هەبوو، وە توانای یارمەتیدانم هەبوو بۆ گۆڕانكاری هێنان بەسەر دنیادا.

دووبارە بيرم لەو كێوانە ئەكردەوە كە لەسەر ڕێگادا ئەمبينين. جوان بوون، جل و بەرگى ڕەنگاو ڕەنگيان دەپۆشى بۆ ئەوەى ئەگەر لە نـاو بـەفردا وون بـوون، بياندۆزنەوە، وە ڕێگاى ڕاستيان بۆ گەشتن بە لوتكەى كێو دەناسى.

بەر لەمە لە ناو ڕێگادا مێخى ئەلەمنيۆميان داكوتا بـوو: تـەنها كارێـك كـە ئەبوواية ئە نجاميان بداية، ئەوە بوو كە گوريسەكانيان لـە ئەڵقەكانيانـەوە تێپەڕ كردايە بۆ ئەوەى بە دڵنياييەوە سەركەون. بۆ ووتنى داستان ڕۆژەكـانى پشوو لێرە بوون، وە دوو شەممان ئەگەڕانەوە بۆ سەر كارى خۆيـان، لەگەڵ ئەم هەستەدا ڕووبەڕووى سروشت ئەبوونەوە ـــ وە سەركەوتن.

بەڵام بەم شێوەيە نەبوو. بێژەرانى داستانى ڕاستى ، يەكەمين كەسانێك بـوون كە بڕياريان دا ڕێگاكان كەشف بكەن، كەسانێك كە ئەگەشتبوونە نيوەى ڕێگا و لە درز و ترەكى بەردەكانەوە كەوتنە خوارەوە. ئەوانەى كە پە نجەكانيان بە هۆى سەرماوە لە دەستدا. كەسانێك كە هيچ نيشانەيەكيان لێوە دەرنەكـەوت. بەڵام ڕۆژێك كەسێك گەشتە لوتكەى ئەو ساترەيە.

وە چاوانى يەكەمين چاوانێك بوو كە ئەو ديمەنەى بينى، وە دڵـى لـە شـاديدا لێى ئەدا. ئەو بە دژوارييەكان ڕازى بوو، وە ئێستا بە سەركەوتنى خۆى، ڕێزى بۆ تەواوى ئەو كەسانە دادەنا، كە لە هەوڵدانى خۆياندا كوژرابوون.

دوور نيە كەسانێك لە خوارەوەن وا بير بكەنەوە: ( لەو سەرەوە هيچ شتێك نيـە جگە لە ديمەنێك، ئەم كارە چ بايەخێكى هەيە؟ )

بەڵام يەكەمين كەس كە سەركەوت دەيزانى چ بايەخێكى هەيە: ڕازى بوون بـۆ بەربەرەكانى كردن و پێشڕەوى. بە ئاگا بوون لەوەى كە هيچ ڕۆژێك لە ڕۆژێكى تر ناچێت، وە هەر كێوێك تايبە تمەنـدى و سـەير و سـەمەرەى خـۆى هەيـە، ساتى جادوويى خۆى لە نێو ئەو ڕۆژگارەدا لەناو نـەبات و ئەسـتێرە گـەلێكى نوێ دێنە ئاراوە.

بە دڵنياييەوە يەكەمين كەسێك كە بەسەر ئەو كێوەدا سەركەوت ، هەمان پرسيارى كردووە:

(ڕۆژەكانى ئەمانە هەميشە وەكو يەكە، ئەمە چ بايەخێكى هەيە؟ )

ئێستا كێوەكان هەموويان كەشف كراون، ئيتر دورگەيەكيش ـــ هەرچەندە بچوكيش بێت ـــ لەسەر رووى زەوى نەبوو كە بتوانرێت كەشف بكرێت. بەلاَم داستانە گەورەكانى ڕۆح هێشتا بەردەوامن ـــ وە ئێستا يەكێك لەو داستانانە بۆ من نمايش كرا بوو.

ئەمە بەرەكەتێك بوو. قەشەكە نەيدەزانى. ئەم دەردانە ئازار بەخش نين.

خۆشبەخت كەسانێكن كە توانيان يەكەمين هەنگاو هەڵگرن. ڕۆژێ خەڵكى تێدەگەن كە مرۆڤ نەتوانێت بە زمانى فريشتەكان بدوێت، كە هەموو يەكێ لە ئێمە خەلاَتەكانى ڕوح القدس مان هەيە، وە دەتوانين سەير و سەمەرە بكەين، چارەسازى بكەين، پێشبينى بكەين، تێبگەين.

تا زەردەپەڕ لە شيودا ڕێگەمان ئەكرد و دەورانى منداڵيمان بە بير خۆمان ئەهێنايەوە، يەكەم جار بوو كە ئەم كارەم ئەكرد، لە كۆچەكەماندا تا بيلباو وا دەهاتە بەر چاو كە هيچ پەيوەندييەكى بە سورياوە نيە.

بەلاَم ئێستا سەبارەت بە يەك بە يەكى هاوڕێكانمان دەپپرسى، دەيوويست بزانێ خۆشبەختن يان نا، وە لە ژيانداا بە چيەوە خەريكن.

سەرئەنجام گەشتين بە گەورەترين فوارەى پيدرا ـــ كە بە جۆگەلەى بچوكەوە بەسترا بوو وە نزيكەى سێ مەتر بەرز ئەبوويەوە. لە كەنارى فوارەكەدا ڕاوەستام، وە گوێم بۆ هاژە هاژەكەى ڕادێرا، سەيرى پەلكە زێرينەيەكمان ئەكرد كە لە دڵۆپە ئاوەكانەوە سەرچاوەى گرتبوو.

ووتم: (يالى ئەسپ. ) سەرم سوڕ ئەما كە هێشتا ناوێكم لە بيرە كە ماوەيەكى زۆر بوو نەمبيستبوو.

ووتی: (لە بیرمە...)

ـــ (بەڵێ! دەزانم ئەتەوێ بڵێی چی!)

هەڵبەتە کە ئەمزانی! فوارەکە ئەشکەوتێکی گەورەی لە پشت خۆیەوە حەشار دابوو. هێشتا منداڵ بووین، لە یەکەمین گەڕانماندا لە پەرستگای پیدرا دەگەڕاینەوە و تا ڕۆژانی دوایی سەبارەت بەو پەرستگایە ئەدواین.

گفتەکەی تەواوکرد: (بڕۆین بۆ ئەشکەوت!)

تێپەڕین بە ناو ئەو فوارەیەدا زۆر دژوار بوو. قەشە دێرینەکان تونێلێکیان دروست کردبوو کە لە بەرزترین لوتکەی فوارەکەوە دەستی پێدەکرد و دەچوو بە ناخی زەویدا و دەگەشتەوە بە پشتی ئەشکەوتەکە.

دۆزینەوەی ڕێگەی چوونە ژوورەوە دژوار نەبوو. لەوانەیە هاوینەکان، ڕووناکی بەس بوو تا ڕێنیشاندەر بێت بۆ دۆزینەوەی ، بەلام ئێمە لێرەدا تەنها بووین و تونێلەکە بە تەواوی تاریک بوو.

پرسیارم کرد: (هەر بەم شێوەیە بڕۆین؟)

ـــ (هەڵبەتە. متمانە بە من بکە.)

لە چاڵی کەنار فوارەکەوە چووینە خوارەوە. تاریکی سەری لێ تێک دابووین، دەمانزانی بۆ کوێ ئەڕۆین ـــ وە داوای لە من کردبوو کە متمانەی پێ بکەم.

هەر بەو شێوەیە زیاتر ڕۆدەچووینە خوارەوە، بیرم کردەوە: (خودایە، سوپاسگوزارم. چونکە من مەڕێکی وون بووم و تۆ دووبارە منت دۆزییەوە. چونکە ژیانم مردبوو تۆ دووبارە زیندووت کردەوە. چونکە ئەوینێکی تر لە دڵمدا شوێنی نەبوو تۆ دووبارە ئەم بەرەکەتەت بۆ گەڕاندمەوە.)

شانەکانیم گرتبوو. خۆشەویستەکەم بە ئاگا بوو لە هەنگاوەکانی من لە تاریکیدا دەیزانی دووبارە ڕووناکی ئەبینینەوە و شادیمان بۆ دێنێتەوە. لەوانەیە لە داهاتوودا، ساتێك هەبێت کە ئەم حاڵەتە پێچەوانە بێتەوە،

ئەو کاتە من ئەوم بەم ئەوین و بەم متمانە ڕێنمایی ئەکرد، شوێنێك کە بتوانین پێکەوە پشوو بدەین.

بە هێواشی ئەڕۆشتین وەك ئەوەی کە ئەم ڕۆچوونە هەرگیز تەواو نەبێت. پێدەچێت ئەمەش مەراسیمێك بوو بێ ــ کۆتایی دەورەیەك کە تیایدا هیچ نورێك لە ژیانمدا نەدەدرەوشایەوە. کاتێ کە لەو تونێلەدا ڕێگەمان ئەبڕی، بە بیری خۆمم هێنایەوە کە بە یەکجار دواکەوتن چەندە کاتم بە فیڕۆ داوە، هەوڵم ئەدا لە ناو خاکدا ڕەگ و ڕیشە داکوتم کە ئیتر هیچ شتێك تیایدا ئەڕوێت.

بەلام خودا میهرەبان بوو، وە جارێکی تر چێژی لە دەست چووی بۆ گەڕاندمەوە، وە ئەو داستانانەی بۆ گەڕاندمەوە کە خەونم پێیانەوە ئەبینی، پیاوێك کە ــ خۆ ئەویستانە ــ تەواوی تەمەنم چاوەڕوانی بووم. هیچ هەستم بە پەشیمانی نەدەکرد کە خەریکە واز لە پەرستگا دێنێت، چونکە بۆ خزمەتکردنی دینی خودا ڕێگا گەلێکی زۆری تر هەبوو، هەر بەو شێوەیەی کە باوکی ڕۆحانی ووتی، وە ئەوینی ئێمە ئەم ڕێگانەی چەند بەرامبەر ئەکرد. لە ئێستا بە دواوە، منیش بوارێکم بۆ خزمەتکردن و یارمەتیدان هەیە ... وە هەمووشی لە پێناوی ئەودا بوو.

دەچووینە نێو دنیاوە بۆ خەڵکی و بۆ یەکتری ئارامیمان دەهێنا.

ــ ( خودایە، سوپاسگوزارم کە یارمەتیت دام خزمەت بکەم. وە فێرمکە تا شایستەی ئەو بم. وە هێز و توانام پێ ببەخشە تا بەشێك لە ڕسالەکانی ئەو بم، لەگەڵ ئەودا دنیا بپێوم، دووبارە ژیانی ڕۆحانیم نوێ بکەرەوە. کارێك بکە کە تەواوی ڕۆژەکانی ئێمە وەکو ئەم ڕۆژانە بێت ــ لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر بڕۆین، نەخۆشەکان چارە بکەین، دەردەدارەکان هێور بکەینەوە. )

له ناكاو دەنگی ئاو گەڕایەوە، ڕوناكی ڕێگاكەی ڕووناك كردەوە، وە ئەوپەڕە تاریكەكە گۆڕرا بۆ یەكێك لە جوانترین دیمەنەكانی سەر زەوی. لە ناو ئەشكەوتێكی گەورەدا بووین ــ بە ئەندازەی كەنیسەیەك. سێ دیواریان لە بەرد بوو چوارەمینیان لە یاڵی ئەسپ، كە ئاو لە بەردەمیەوە لە دەریایەكی سەوزدا لە ژێری پێماندا ڕۆ دەچوو.

تیشكی هەتاو بەناو فوارەكەدا تێپەڕ ئەبوو وە دیواری ئەشكەوتەكەی ڕووناك ئەكردەوە.

پاڵمان بە دیوارە بەردینەكەوە دا و هیچمان نەووت.

پێش تر، كاتێ منداڵ بووین، ئێرە حەشارگەی كیفی دەریایی بوو كە پارێزگاری لە گەنجی خەیاڵاوی منداڵانە ئەكرد. ئێستا سەیر و سەمەرەی دایكی زەوی بوو، هەستم ئەكرد كە لە ناو سكی ئەودام، دەمزانی لێرەیە، بە دیوارە بەردینەكانی پارێزگاری لە ئێمە دەكات، وە تاوانەكانی ئێمە بە دیوارە ئاوییەكەی پاك دەشۆرێتەوە.

بە دەنگی بەرز ووتم : (سوپاسگوزارم!)

ــــ (سوپاسی كێ دەكەی؟)

ــــ (سوپاسی ئەو، وە سوپاسی تۆ كە هۆكارێك بووی تا ئیمانی من بگەڕێتەوە.)

ڕۆشتە كەناری دەریاچەی ژێر زەوی. سەیری ئاوەكەی كرد و زەردەخەنەیەكی كرد.

ــــ (وەرە بۆ ئێرە.)

نزیك بوومەوە.

ووتی : (دەبێ شتێكت پێ بڵێم كە تا ئێستا نەمووتووە.)

دەستەواژەكانی منیان ترساند. بەڵام نیگای ئارام بوو دووبارە ئارام بوومەوە

ـــــ ( تەواوی مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوی خەلاتیان هەیە. لە هەندێ لەو مرۆڤانەدا خۆی بۆ خۆی دەردەکەوێت، وە هەندێکی تریان دەبێ بۆ بەدەست هێنانی زەحمەت بکێشن. من چوار ساڵی تەواو بۆ بەدەست هێنانی خەلاتەکەم لە پەرستگادا زەحمەتم کێشا. )

ئێستا ئەبووایە من نمایشم بکردایە، هەمان دەلیلێک کە ئەو پیرە پیاوە ئەیهێشت بچینە کەنیسەوە، خۆی فێری کردم.

ئەبوایە وا خۆم پیشاندایە کە هیچ نازانم.

بیرم کردەوە: ( هەڵە نیە. ئەم ڕێگایە بە ناکامی تەواو نابێ، بە شادی دەگات. )

پرسیارم کرد: ( لە پەرستگادا چیت دەکرد؟ ) هەوڵم ئەدا بوارێکی تەواو بۆ ئامادەکردنی خۆم بۆ ئەم نمایشە بەدەست بێنم.

ووتی: ( بابەتەکە ئەمە نیە. بابەتەکە ئەوەیە کە خەلاتم لە نێو خۆمدا پەروەردە کرد. دەتوانم ـــــ کاتێ خودا بیەوێ ـــــ خەڵکی دەرمان بکەم. )

وەلامم دایەوە: ( زۆر باشە! ) وە هەوڵمدا خۆم بە سەرسامی پیشان بدەم:

ـــــ ( ئیتر پێویست ناکات پارە بە پزیشك و دەرمان بدەین. )

پێنەکەنی. هەستم بە گێلی کرد.

درێژەی پێدا: ( خەلاتەکەم بە ڕاهێنانی کرامەت پەروەردە کرد کە خۆت بینیت. سەرەتا سەرسام بووم. دۆعام ئەکرد، لە سەر دەستی من سەلامەتی بۆ زۆرێك لە نەخۆشان بگەڕێتەوە. کەم کەم ناو بانگم بلاو بوویەوە و هەموو ڕۆژێك خەڵکی لە بەردەم پەرستگادا ڕیزیان دەبەست تا هاوکارییان بکەم. لە هەر برین و هەڵئاوسانێکدا، برینەکانی عیسام ئەبینی. )

ووتم: ( شانازیت پێوە ئەکەم. )

ـــ ( له پەرستگادا زۆر کەس دژایەتیان ئەکردم، بەڵام مامۆستاکەم بە هەموو شێوەیەك یارمەتی ئەدام. )

ـــ ( درێژە بەم کارە ئەدەین. پێکەوە دنیا دەخەینە ژێر پێمان. من برینەکان پاك دەکەمەوە، تۆ برینەکە سارێژ دەکەی، وە خوداوەندیش سەیر و سەمەرەکانی پیشان ئەدات. )

چاوەکانی لە من وەرگێڕا و سەیری دەریاچەکەی کرد. بە ڕواڵەت لەو ئەشکەوتەدا بوونی هەبوو ـــ وەکو ئەو شەوەی کە پێکەوە لە کەناری چاڵی سەن ساوەن مەستمان کردبوو.

درێژەی پێدا: ( پێشتر بۆم باس کردووی، بەڵام دووبارەی دەکەمەوە. شەوێکیان، لەخەو هەستام، ژوورەکەم لێوان لێو لە نور بوو. ڕووخساری خوای خانم و نیگای ئەوینانەیم بینی. لەو ڕۆژەوە، هەر کاتێ ئەو ئەبینم. ناتوانم ئەو بێنمە گۆ، تەنها لە ئان و ساتی تایبەتدا بڕیار ئەدات دەرکەوێت. )

لەم کاتەدا، لە مەسەلەی کاری هەڵگەڕاوە ڕاستیەکانی کەنیسەدا بوونم هەبوو. دەمزانی کە بەرپرسیارێتی من لەسەر ڕووی زەوی، جیایی لە دەرمان، دەستەمۆ کردنی ڕێگەی ڕازی بوونی دووبارەی ئافرەت ـــ خوداوەندە. تا بنەچەی مێینە، ستونی ڕەحمەت، دووبارە بەرپا بێت ـــ وە پەرستگای بچوك دووبارە لە دڵی مرۆڤەکاندا بنیاد بنرێتەوە. )

سەیریم کرد. حاڵەتی ڕووخساری کە پێش تر تورە بوو، دووبارە ئارام بوویەوە.

ـــ ( ئەمە بەهایەکی هەبوو... کە ئامادە بووم ڕازی بم. )

بەبێ دەنگی مایەوە، نەیدەزانی چۆن درێژە بە داستانەکەی بدات.

پرسیارم کرد: ( بۆچی دەڵێی "بەهایەکی هەبوو؟" )

ـــــ ( ڕێگـەى خـوداى خـانم تـەنها بـە دەسـتەواژە و سـەير و سـەمەرەكان دەكرايەوە. بـەڵام دنيـا بـەم شـێوەيە نيـە. دژوار تـر لەمەيـە : فرمێـسك، گونجاندن، ڕەنج. )

لەگەڵ خۆمدا بيرم كردەوە: ( ئەو قەشەيە هەوڵى داوە دڵى بترسێنێت. بەڵام من ئارامى دەكەمەوە. )

وەڵامم دايەوە: ( ڕێگاى ڕەنج نيە، ڕێگەى شانازى و خزمەت كردنە. )

ـــــ ( زۆرينەى مرۆڤەكان هێشتا باوەڕيان بە ئەوين نيە. )

هەستم كرد ئەيەوێ شتێك بە مـن بڵێـت و ناتوانێـت. پێدەچـێ بمتوانيايـە يارمەتى بدەم.

قسەكانيم پێ بڕى:

ـــــ ( من لەم بارەيەوە بيرم كردۆتەوە. يەكەمين پياوێك كە بەسەر بـەرزترين لوتكەى كێوى پيرنەدا سەركەوت، تێگەشت كە ژيان بەبێ داستان بێـژى هـيچ جوانيەكى نيە. )

پرسيارى كرد: ( تۆ چى لە جوانى تێدەگەيت؟ ) دوويـارە تـورە بـوو بوويـەوە: ( يـەكێك لـە ناوەكـانى خـواى خـانم، "Nossa Senhora das Gracas" "خانمى ميهرەبانە". )

هەرگيز ناتوانين دەربارەى ژيانى خەڵكى دادوەرى بكەين، چونكە هەر كەسـە و ڕەنج و شاراوەى تايبەت بە خۆى هەيە. ئەوەى كـە بزانـێ لەسـەر ڕێگەيـەكى ڕاستى ئەوە شتێكە، بەڵام ئەگەر وا بزانى كە ڕێگـەى ڕاسـت تـەنها ئەمەيـە، ئەوە شتێكى ترە.

عيسا ووتى: ( ماڵى باوكى من ژوورى زۆرى هەيە. خەڵات چاكە و سۆزە. بـەڵام ژيانى شايستە، ئەوين بە هاوشێوە، وە كار كردنيش چاكە و سـۆزێكە. مريـەم

لەسەر ڕووی زەوی مێردێکی هەبوو کە هەوڵی ئەدا بەهای کاری بێ ناو نیشان پیشان بدات.

هەرچەندە هەواڵێکی ئەوتۆ لەوەوە نەبوو، ئەو بوو کە بۆ ژن و کوڕی ژنەکەی پەناگە و ڕۆژی دابین ئەکرد تا ئەوانە بتوانن ئەرکەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن. کاری ئەو بە قەدەر کاری ئەوانە گرنگ بوو، هەرچەندە هیچ کەس بایەخی پێ نادات. )

هیچم نەووت. دەستمی گرت.

— ( بمبوورە بە هۆی توڕەییەکەمەوە. )

دەستیم ماچ کردوو خستمە سەر ڕوومەتم.

زەردەخەنەیەکی کرد و ووتی: ( ئەمەوێ هەر ئەمەت بۆ ڕوون بکەمەوە. لەو ساتەوەی کە تۆم دووبارە بینیەوە، تێگەشتم کە ناتوانم تۆ ناچار بکەم بە ڕەنج کێشان بەهۆی بەرپرسیارییەتی خۆمەوە. )

کەم کەم نیگەران نەبووم.

— ( دوێنێ درۆم لەگەڵ کردی. سەرەتا و کۆتا درۆم لەگەڵ تۆدا. لە ڕاستیدا لە باتی ڕۆشتنم بۆ پەرستگا، ڕۆشتم بۆ کێوەکان و لەگەڵ خودای خانمدا گفتوگۆم کرد.

ووتم ئەگەر ڕازییە، واز لە تۆ دێنم و درێژە بە ڕێگەکەم نەدەم. دەرۆمە بەردەرگای ئەخۆشان، درێژە بە عیبادەتەکانی شەوانەم ئەدەم. ئەگەر لە منی بوێت واز لە نازیزترین کەسم دێنم لە دنیادا: کە تۆیت. )

دووبارە کەوتمە بیری قەشەکە. حەق لای ئەو بوو. ئەو ڕۆژە بەیانیەکەی، هەڵبژاردنێك لە ئارادا بوو.

درێژەی پێدا: ( بەڵام ئەگەر بکريايە ئەو جامە پیرۆزەی لە ژيانی مـن دوور بخستايەتەوە، بەڵێنم ئەدا لە ڕێگەی ئەوينم لەگەڵ تۆدا، درێژە بە خزمەتكردنی خەڵكی بدەم. )

بە سەرساميەوە پرسيارم كرد: ( مەبەستت چيە؟ )

وەك ئەوەی قسەكانمی نەبيستبێت:

ـــ ( بۆ دامەزراندنی باوەڕ، پێويست بە جێبەجێ كردنی كێوەكـان ناكـات. ئامادە بووم خۆم بە تەنها بەم ڕەنجە ڕازی بم، بـەڵام نەمدەويست كەسێكی تری تيادا شەريك بكەم. ئەگەر درێژەم بەم ڕێگايە بدايە، هيچ كات ماڵێك بە پەردەی سپی و ديمەنی كێواويمان نەدەبوو. )

هاوارم كرد: ( نامەوێ سەبارەت بەم ماڵە هيچ ببيستم! هەتا نەچـوومە نێـو ماڵەكەوە! ) هەوڵم ئەدا ڕێگە لە گريانەكەم بگرم: ( دەمەوێ لەگەڵ تـۆدا بم، لە ڕووبەڕوو بوونەوەكاندا لەگەڵ تۆدا بم، دەمويـست لـە كەسـانێك بم كـە سەرەتا جەستە بە داستانەكان دەسپێرن.

تێناگەيت؟ تۆ باوەڕی منت گەڕاندووەتەوە! )

هەتاو شێوەی خۆی گۆڕی بوو لە ئێستادا تيشكەكانی ديوارەكـانی ئەشـكەوتی لە خۆيدا نوقم كردبوو. بەڵام تەواوی ئەو جوانيە واتای لە دەست دابوو.

خوداوەند دۆزەخی لە ناوەڕاستی بەهەشتدا حەشار دابوو.

ووتی: ( نايناسی، ترسناكی ناناسی! ) چـاوەكانم تكايـان لێ ئـەكردم كـە تێبگەم.

ـــ ( بەڵام تۆ لەگەڵ ئەودا خۆشبەخت بووی! )

ـــ ( خۆشبەخت بووم. بەڵام ئەم ترسناكيە تايبەتە بە من! )

ويستم گفتەكانی پێ ببڕم، بەڵام ڕێگەی نەدا.

درێژەی پێدا : ( هەر لەبەر ئەمە، دوێنێ، داوام لە کچە مریەم کرد کە سەیر و سەمەرە بکات. وویستم خەڵاتەکەم لێ بسەنێتەوە. )
ئەوەی کە ئەمبیست باوەڕم نەدەکرد.
ـــ ( من کەمێ پارەم هەیە، وە لە دوای ئەم هەموو ساڵە کۆچە، ئەزمونێکی باشم هەیە. ماڵێك دەکڕین، کارێك ئەدۆزینەوە، وەکو یوسفی پیرۆز خزمەت بە خودا دەکەین، بۆ ئەوەی باوەڕم بە زیندوویی بهێڵمەوە پێویستم بە سەیر و سەمەرە نیە. پێویستم بە تۆ هەیە. )
پێکانم لاواز بوون، خەریك بوو لە هۆش ئەچووم.
درێژەی پێدا : ( وە ئەو ساتەی کە داوام لە کچە مریەم کرد خەڵاتەکەم لێ بسەنێتەوە، دەنگانێك هاتنە گۆ. دەنگەکان ووتیان : "دەستت بخەرە سەر زەوی. خەڵاتەکان لە تۆ جیا ئەبنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ دایك." )
ترس دایگرتم.
ـــ ( واتە..... )
ـــ ( بەڵێ. دەستورەکانی ڕوح القدسم ئەنجامدا. تەم و مژ لەناو چوو بوو هەتاو دووبارە لە نێو کێوەکاندا ئەدرەوشایەوە. هەستم کرد کە کچە مریەم لێم تێدەگات. چونکە ئەویش زۆر هۆگری ئەوین بوو. )
ـــ ( بەڵام ئەو بە دوای مێردەکەیدا چوو! وە ڕێگەی کوڕەکەی هەڵبژارد! )
ـــ ( ئێمە توانای ئەومان نیە، پیلار. خەڵاتەکەی من بە کەسێکی تر ئەگات
ـــ هەرگیز لەناو ناچێت.
دوێنێ لەو بارەوە تەلەفۆنم کرد بۆ بارسلون و کۆنفرانسەکەم شێواند. دەڕۆین بۆ Zaragoza : تۆ لەوێ کەسانێك دەناسی و دەتوانین لەوێ دەست پێبکەین. زۆر بە زوویی کارێك ئەدۆزمەوە. )
ئیتر نەمدەتوانی بیر بکەمەوە.

ووتى: ( پيلار )

به‌لام ئيتر خه‌ريك بووم به‌ تونێله‌كه‌دا سه‌رده‌كه‌وتم، به‌بێ ئه‌و شانه هاوڕێييانه‌ى كه‌ ڕێنمايم بكات ـــ وه‌ نه‌خۆشيكى زۆر به‌ دوامدا ده‌هات كه‌ پێده‌چوو بمرن، خانه‌واده‌يه‌ك كه‌ ڕه‌نجيان ده‌كێشا، سه‌ير و سه‌مه‌ره‌يه‌ك كه‌ ئيتر ڕووى نه‌ده‌دا، پێكه‌نينێك كه‌ ئيتر دنياى لێوان لێو له‌ سۆز نه‌ده‌كرد، كێوانێك كه‌ له‌ شوێنى خۆياندا ده‌مانه‌وه‌. هيچ شتێكم نه‌ده‌بينى جگه‌ له‌ تاريكى كه‌ گومڕاى كردبوم.

## هەینی

## 1993/12/10

لە کەناری ڕووباری پیدرا دانیشتم و گریام. یادگاریەکانی ئەو شەوە ئاڵۆز و بێ هۆش بوون. تەنها دەمزانی تا لێواری مەرگ ڕۆشتووم، بەلام نەمدەزانی ڕووخساری چۆن چۆنی بوو وە دەیویست بۆ کوێم بەرێت.

حەز دەکەم بە بیری خۆمی بێنمەوە، تا بتوانم لە دڵمدا دەری بکەم. بەلام ناتوانم. هەموو شتێك وەکو خەون بوو لە لام، لەو کاتەی کە لە تنونێلە تاریکەکە هاتمە دەرەوە، چوومە ناو دنیایەکەوە کە شەوی لە خۆیدا نوقم کردبوو.

هیچ ئەستێرەیەك لە ئاسماندا نەدەدرەوشایەوە. بەبێ ئاگایانە بە بیری دێنمەوە کە تا ئوتۆمۆبیلەکان ڕۆشتم، جانتا بچوکەکەم هەڵگرتبوو بێ ئامانج بەڕێ کەوتم. حەتمەن ڕوو بە شەقام ڕۆشتبووم، هەوڵم دابوو ئوتۆمۆبیلێك بۆ گەڕانەوەم بۆ "Zaragoz" پەیدا بکەم ـــ وە نەمتوانیبوو پیدای بکەم، بە ئەندازەی خۆی خودا ئەوینی بە جیهان بەخشیبوو ـــ چونکە ئەویش کوڕەکەی دابوو تا بە دەستی مرۆڤەکان قوربانی ببێت. بەلام ئایا ئەو زانی بە ئەوینی ئافرەتێك لەگەڵ پیاوێکدا؟

پێدەچێت ئەو بەهۆی ئەوینەوە ڕەنجی بردبێت، بەلام ئەوینێکی جیاواز بوو. مێردە پایەدارەکەی هەموو شتێکی دەزانی، سەیر و سەمەرەی نەکرد. ئەو هەرگیز نەیدەزانی کە پەراوێز خستنی پیاوێك یان ئافرەتێك چ واتایەکی هەیە. کاتێ یوسف وویستی بەهۆی سك پڕییەوە لە ماڵ دەری بکات، مێردی ئاسمانی فریشتەگەلێکی نارد تا ڕێگەی لێبگرن.

کوڕەکەی وازی لەو هێنا. بەلام کوڕەکان هەمیشە دایك و باوکی خۆیان پەراوێز دەخەن. ڕەنج کێشان بە هۆی ئەوینەوە بە هەموو شێوەکانیەوە، لە پێناوی

ئەويندا رەنج كێشان له جيهاندا يا له پێناوى ئەوين لەگەڵ كوڕدا رەنج كێشان ئاسانه. ئەم رەنجه وەها هەستێك به مرۆڤ ئەبەخشێت كه له ژياندا بوونى هەيه، كه دەردێكى بەجێ و گەورەيه. رەنج كێشان له پێناوى هەر هۆيەك يا رِسالەيەك ئاسانه؛ ئەم رەنجه گەورەيى به دڵى مرۆڤ ئەبەخشێت.
بەڵام چۆن چۆنى دەتوانرێت رەنج كێشان بەهۆى پياوێكەوه روون بكرێتەوه؟ شتێكى نەگونجاوه.
لەم رەنجەدا، مرۆڤ هەست دەكات له دۆزەخدايه، چونكه هيچ شەرافەتێك و گەورەييەكى تێدا نيه.... تەنها نەگبەتيه.
ئەو شەوه لەسەر زەوى سەهۆڵبەنداندا خەوتم سەرما زۆر به زوويى بێ هۆشى كردم. تا چەند سائێك بيرم كردەوه ئەگەر لێفەيەيەك بۆ خۆم پەيدا نەكەم، دەمرم ــ بەڵام له كوێ؟ تەواوى ئەوانەى كه له ژيانمدا بۆم گرنگ بوون، سەخيانه له هەفتەيەكدا بۆم هەرزان بوون و له خولەكێكيشدا لێيان زەوت كردم، بەبێ ئەوەى كه بوارێكم هەبێت تا شتێك بڵێم.
جەستەم له سەرماندا هاتە لەرزين، وه بايەخم پێ نەدا. ئەم لەرزينه سەرئەنجام تەواو دەبوو. سەرئەنجام ووزەى جەستەم له هەوڵدانيدا بۆ دابينكردنى گەرمايى بۆ من ماندوو ئەبوو و وه ئيتر هيچ كارێكى له دەست نايەت. دوايى جەستەم دەگەڕێتەوه بۆ ئارامييەكى ئاسايى خۆى، وه مەرگ له ئامێزمدا دەكوژێت.
زياتر له كاتژمێرێك هەڵدەلەرزيم، وه دوايى ئەوه ئارامييم بۆ گەڕايەوه.
پێش له داخستنى چاوەكانم، ئاوازى دايكمم بيست. داستانێكى بۆ باس ئەكردم، له منداڵيدا بۆى باسكردبووم، بەبێ ئەوەى كه بزانێت ئەو داستانه داستان و بەسەرهاتى منه.

ئاوازی دایکم، له ئامێزی خەو و بێ بابەیەخیدا ووتی: ( لاوێك و کچێکی دێوانه ئاسا ئەویندداری یەك بوون و بڕیاریاندا زەواج بکەن. دەستگیرانەکان هەمیشه خەلات بە یەکتر ئەبەخشن.
لاوەکه فەقیر بوو ـــ تەنها داراییەکەی کاتژمێرێك بوو کە لە باپیریەوه بۆی مابوویەوه. بیری لە زوڵفە جوانەکانی خۆشەویستەکەی ئەکردەوە، بڕیاری دا کاتژمێرەکەی بفرۆشێت تا تەوقەیەکی ئالتونی جوانی بۆ بکڕێت.
کچەکەش پارەی نەبوو تا خەلات بۆ دەستگیرانەکەی بکڕێت. دوایی ڕۆشت بۆ گەورەترین دووکانی تاجری شار و زوڵفەکانی فرۆشت. بە پارەکەی، زنجیرێکی کاتژمێری زێڕینی بۆ خۆشەویستەکەی کڕی.
کاتێ لەگەڵ دەستگیرانەکەیدا یەکتریان بینیەوه، کچەکە بۆ ئەو کاتژمێرەی کە فرۆشتبووی، زنجیرێی کاتژمێری زێڕنی بە لاوەکە بەخشی، وە لاوەکەش بۆ ئەو زوڵفانەی کە بوونیان نەما بوو، تەوقەیەکی ئالتونی بە کچەکە بەخشی. )
بە جوڵاندنی دەستی پیاوێك بەخەبەر هاتم.
ووتی: ( بهەتاوەوه! زوو بهەتاوەوه! )
نەمزانی چی بووه و توانای بەرەنگاریم نەبوو. پیاوەکە دەمی کردەوە و شلەیەکی کرد بە گەرومدا و دەرونی گەرم کردەوە. سەیرم کرد پیاوەکە تەنها کراسێکی لەبەردایە. پاڵتۆکەی له بەری مندا بوو.
دووبارە جەختی کردەوە: ( هی تر بهەتاوەوە! )
نەمدەزانی چی بووه، بەلام گوێڕایەڵیم کرد. دوایی دووبارە چاوەکانم داخستەوە.
لە پەرستگادا بەخەبەر هاتم، ئافرەتێك سەیری ئەکردم.
ووتی: ( خەریك بوو بمریت. ئەگەر پاسەوانی پەرستگاکە نەبووایە، ئێستا لە خزمەتدا نەبووین. )بە سەر گێژەیەکەوە لە شوێنی خۆم هەستام، نەمدەزانی

چی دەکەم. بڕێك لە یاداوەرییەکانی دوێنێ زیندوو بوونەوە، وە بیرم کردەوە بریا پاسەوانی پەرستگاکە بەوێدا نەڕۆشتایە.

بەلام ئێستا زەمانێکی گونجاو بۆ مردن تێپەڕی بوو. ئاشکرا بوو ئەبوایە درێژەم بە ژیان بدایە. ئافرەتەکە بردمیە نێو چێشتخانەوە و قاوە و بسکیت و نانی دەرخوارد دام. هیچی نەپرسی و منیش هیچم بۆ ڕوون نەکردەوە. کاتێ دەستم لە خواردن هەلگرت، جانتاکەی بۆ گەڕاندمەوە و ووتی:

ـــ (سەیرکە هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدایەتی و هیچ شتێك نەگۆڕاوە؟)

ـــ (بە دلنیاییەوە لە شوێنی خۆیدایەتی. چونکە من هیچم نیە.)

ـــ (ژیانت هەیە کچم. ژیانێکی دوور و درێژ. باشتر ئاگات لێی بێ.)

وویستم دەست بە گریان بکەم، ووتم: (لەم نزیکانەدا شارێك هەیە کە کەنیسەی هەیە. دوێنێ بەر لەوەی بێم بۆ ئێرە، ڕۆشتم بۆ ئەو کەنیسەیە، لەگەلَ.....)

نەمدەزانی چۆن چۆنی ڕوونی بکەمەوە:

ـــ (لەگەلَ دۆستێکی دەورانی مندالیدا. ئیتر لە ڕۆشتن بۆ کەنیسە ماندوو بوو بووم، بەلام کەنیسەکان زەنگیان لێدەدا و ئەو ووتی ئەمە ئاماژەیەکە، کە دەبێ بچینە ناو کەنیسەوە.)

ـــ (چووینە ناو کەنیسەوە. هیچ کەسی لێ نەبوو، تاریك بوو. هەولم ئەدا نیشانەیەك بدۆزمەوە، بەلام تەنها هەمان گومەز و هەمان قەدیسم ئەبینی. لە ناکاو لە بەشی سەرەوە دەنگێکم بیست، هەر لەو شوێنەی کە ئۆرگ هەبوو. کۆمەلێك لاو ئۆرگیان لێدەدا. بڕیارماندا دانیشین تا ئەو کاتەی درێژە بە کۆچەکەمان ئەدەین، کەمێك گوێ بۆ مۆسیقاکەیان ڕادێرین.

دوای کەمێك، پیاوێك هاتە ژوورەوە و لە پەناماندا دانیشت. شادمان بوو، هاواری کردە ئەو لاوانە کە "Paso doble" لێبدەن.

ئافرەتەکە ووتی: (مۆسیقای گا بازی! ئومێدەوارم ئەم کارەتان نەکردبێ.)

ـــــ (ئەیانکرد. بەڵام پێکەنین و لە باتی ئەوە ئاهەنگی "Flamenga" یان لێدا. من و دۆستە دێرینەکەم وا هەستمان ئەکرد کە ئاسمان بەسەرماندا ڕووخاوە، کەنیسە، زاڵبوونی تاریکی، ئاواز، و شادمانی ئەو پیاوەی لە پەناماندا بوو ـــــ هەموو سەیر و سەمەرە بوو.

کەم کەم کەنیسە پڕ بوو. لاوەکان درێژەیان بە لێدانی مۆسیقای "Flamenga" دا هەر کەسێك دەهاتە ژوورەوە، پێدەکەنی و بڕوای ئەدا شادمانی مۆسیقا ژەنەکان ئەویش بگرێتەوە.

دۆستەکەم پرسیاری کرد ئەمەوێ لە مەراسیمی مەستیدا کە بەم زووییە دەست پێدەکات بەشداری بکەم؟ ووتم نەخێر، کۆچێکی دوور و درێژمان لە پێشەوەیە. بڕیارماندا بڕۆین ـــــ بەڵام سەرەتا لە پێناوی بەخشینی ساتێکی ڕازاوەی تر بە ژیانمان، سوپاسی خودامان کرد.

هەر ئەوەندەی گەشتینە بەر دەرگا، بینیم کەسانێکی زۆر ـــــ پێدەچوو تەواوی خەڵکی ئەو شارە بچووکە ـــــ بەرەو کەنیسە دێن. بیرم کردەوە پێدەچێت ئێرە کۆتا لادێی تەواوی کاسۆلیکەکانی ئسپانیا بێت. پێدەچێت لەبەر ئەوە بێت کە مەراسیمی مەستی لەم شارەدا زۆر سەرقاڵکەر بێ.

کاتێ سواری ئوتۆمۆبیل بووین، کۆمەڵێکی زۆر کە مەیتیان هەڵگرتبوو لێمان نزیك ئەبوونەوە. تابوتێکیان هەڵگرتبوو. کەسێك مردبوو وە ئەو مەراسیمی مەستیە بە هۆی ئەوەوە ڕێکدەخرا. هەر ئەوەندەی شین گێڕان گەشتنە کەنیسە، مۆسیقا ژەنەکان دەستیان هەڵگرت لە لێدانی "Flamenga" و سرودی تەعزیەباریان لێدەدا.)

ئافرەتێك حاچێکی لەسەر سینەی کێشاو ووتی: (خوا لێی خۆش بێ.)

جوڵەکەیم دووبارە کردەوە و ووتم: ( خوا لێی خۆش بێ. بەڵام چوونە ناو ئەو کەنیسەیە لە ڕاستیدا ئاماژەیەك بوو. ئاماژە بەوەی کە خەم و خەفەت هەمیشە لە چاوەڕوانی کۆتایی چیرۆکەکاندایە. )

ئافرەتەکە سەیری کردم و هیچی نەووت. دوایی ڕۆشتە دەرەوە و بە پێنوس و پەڕاوێکەوە گەڕایەوە.

ووتی: ( بڕۆینە دەرەوە. )

پێکەوە چووینە دەرەوە. هەتاو خەریك بوو هەڵدەهات.

ووتی: ( هەناسەیەکی قوڵ هەڵکێشە. ڕێگە بدە ئەم بەرەبەیانیە نوێیە سیەکانت پڕ بکات و لە دەمارەکانتدا جۆگەلە هەڵبەستێت. بە ڕواڵەت دوێنێ بە سوتفە وون نەبوویووی. )

وەڵامم نەدایەوە.

درێژەی پێدا: ( وە هەر بەو شێوەیەی کە واتای ئاستانێکت بۆ باسکردم، لە نیشانەکانی ئەو کەنیسەیە نەگەشتووی. تەنها کۆتاییە خەمناکەکەیت بینیوە. ساتەکانی شادیت لە کەنیسەدا بەسەر برد، لە بیرت کرد. هەست کردن بەوەی کە ئاسمان هاتووەتە سەر زەویت لە بیر کرد، وە لە بیرت کرد ئەزمونی ئەم هەستە لە پەنای ئەودا چەندە جوان بووە... )

هەڵوێستەیەکی کرد، زەردەخەنەیەکی کرد، چاوێکی داگرت و ووتی:

ـــ ( .... دۆستی دەورانی منداڵی! عیسا ووتی: "ڕێگە بدەن پیاوەکان پیاوەکان بنێژن." چونکە دەیزانی کە مەرگ بوونی نیە. ژیان بەر لە لە دایك بوونی ئێمە هەبووە و وە لە دوای ئەمەش کە تەرکی دنیامان کردووە بوونی دەبێت. ) چاوەکانم لێوان لێو بوون لە فرمێسك.

درێژەی پێدا: ( ئەوینیش هەر بەم شێوەیەیە. پێشتریش بوومو تا کۆتاش هەر ئەبێت. ) ووتم: ( وەك ئەوەی لە ژیانی من بە ئاگا بیت. )

ـــــ ( چیرۆكه ئه‌وینداریی‌ه‌كان خـالی هاوبه‌شـی زۆریـان هه‌یـه. منـیش لـه شوێنێكی ژیانمدا، هه‌ر ئه‌وه‌م به‌سه‌ردا هاتووه. به‌لام ئیتر لـه بـیرم كـردووه. شتێك كه له بیرمه، ئه‌وه‌یه كه ئه‌وین له شێوه‌ی پیاوێكی تر، هیـوا گـه‌لێكی تر، خه‌ونێكی تر گه‌ڕایه‌وه. )

پێنوس و په‌ڕاوه‌كه‌ی به من دا.

ـــــ ( هه‌ست به‌چی ده‌كه‌یت بینوسه. له ڕۆحت ده‌ری بێنه و بیخه‌ره سـه‌ر ئـه‌و په‌ڕاوه، وه له دوایدا فڕێی بده. ئه‌فسانه ده‌ڵێت ڕووباری پیدرا ئه‌وه‌نده سارده كه هه‌رچییه‌ك بكه‌وێته ناویه‌وه ـــ گه‌لا، حه‌شه‌رات، په‌ڕی باڵنده‌كان ـــــ ده‌بێت به به‌رد. كه ده‌زانێت؟ پێده‌چێت باش بێت ڕه‌نجه‌كانمان بخه‌ینـه نێـو ئه‌و ناوه‌وه.

په‌ڕاوه‌كه‌م وه‌رگرت، ماچی كردم و ووتی ئه‌گه‌ر وویستم، ده‌توانم بۆ خـواردنی نانی نیوه‌ڕۆ بگه‌ڕێمه‌وه. كاتێ دوور كه‌وته‌وه، هاواری كـرد: ( شـتێك لـه بـیر مه‌كه. ئه‌وین ئه‌مێنێت. ئه‌وه پیاوانن كه ده‌گۆڕرێن! )

پێكه‌نیم، دووباره ده‌ستی بۆ جولاندم.

ماوه‌یه‌ك به سه‌رسوڕمانه‌وه سه‌یری ڕووباره‌كه‌م كرد. ئه‌وه‌نده گریام كـه ئـیتر فرمێسكێكم بۆ نه‌مابووه‌وه.

دوایی ده‌ستم كرد به نوسین.

## دوا ووتار

ڕۆژێکیان نوسیم، وە ڕۆژێکی تریش، وە ڕۆژێکی تریش. هەموو ڕۆژێ بەیانیان دەهاتمە کەناری ڕووباری پیدرا. هەموو ڕۆژێ دەمەو عەسر ئافرەتەکە دەهات بە دوامدا، قۆڵی دەگرتم و دەیبردمە ژوورەکەی کە لە پەرستگایەکی دێریندا بوو.

جل و بەرگەکانی دەشۆردم، نانی ئێوارەی دروست ئەکرد، سەبارەت بە مەسایلی بێ بایەخ ئەدوا، و منی دەخەواند.

ڕۆژێکیان بەیانیەکەی، کاتێ نوسینم لە تەواو بووندا بوو، دەنگی ئوتۆمۆبیلێکم بیست. دڵم لە شوێنی خۆی هەڵکەنرا، بەڵام نەمدەویست باوەڕ بە ووتەی دڵم بکەم. ئیتر لە هەموو شتێك ئازاد تر هەستم بە خۆم ئەکرد، ئامادە بووم بگەڕێمەوە بۆ دنیا، وە دووبارە بەشێك بم لە دنیا.

دژوارترین ساتەکان بەسەر چووبوون ـــ ئێستا تەنها دڵتەنگی مابوویەوە. بەڵام دڵم مافی خۆی بوو. هەتا بەبێ وەرگێڕانی چاوەکانم لەسەر دەست نوسەکەم، هەستم بە دەنگی پێکانی کرد.

لە پەنامدا دانیشت و ووتی: ( پیلار. )

وەڵامم نەدایەوە. درێژەم بە نوسینەکەمدا، بەڵام ئیتر نەمدەتوانی وورد ببمەوە. دڵم بە توندی لێی ئەدا و هەوڵی ئەدا لە ناو سینەم بێتە دەرەوە و خۆی ڕزگار بکات و بە دیداری ئەو شاد بێت. بەڵام ڕێگەم نەئەدا.

هەر لە پەنامدا دانیشت، چاوی بڕییە ڕووبارەکە، وە من بێ وەستان دەمنوسی. تەواوی بەرەبەیا نمان بەم شێوەیە بەسەر برد ـــ وە هیچمان نەووت ـــ وە بێدەنگی شەوێکم بە بیر خۆم هێنایەوە، شەوێك کە پێکەوە لە کەناری چاڵێکدا بەسەرمان برد ـــ وە لە ناکاو تێگەیشتم کە خۆشم ئەوێ.

كاتێ دەستم لە ماندوويەتيدا لە كار كەوت، كەمێك وەستام. دوايى ووتى :

ـــــ (كاتێ لە ئەشكەوتەكە هاتمە دەرەوە، هەوا تاريك بوو وە نەمتوانى بتدۆزمەوە. دوايى ڕۆشتم بۆ "Zaragoz". تا سوريا ڕۆشتم. تەواوى دنيا بە دواتدا گەڕام. بڕيارمدا بگەڕێمەوە بۆ پەرستگاى پيدرا بەڵكو نيشانەيەك لە تۆوە پەيدا بكەم، وە ئافرەتێكم بينى.

"شوێنەكەتى پێ نيشاندام. وە ووتى تەواوى ئەم ڕۆژانە چاوەڕوانم بوويى. )

چاوەكانم پڕ بوون لە فرمێسك.

ـــــ (تا كاتێك لە كەنارى ئەم ڕووبارەداى، لە كەنارت دەمێنمەوە. وە ئەگەر بڕۆى بخەوى، لە بەردەم ماڵەكەت دەخەوم. وە ئەگەر بۆ شوێنى دوور بڕۆى، بە دواتدا دێم.

تا كاتێك بە من بڵێى : ئيتر بڕۆ! ئەو كاتە دەڕۆم. بەڵام تا كۆتايى تەمەنم خۆشم ئەوێ. )

ئيتر نەمدەتوانى فرمێسكەكانم ڕاگرم. سەيرم كرد ئەويش دەگرى.

ووتى : (ئەمەوێ شتێك بزانى.... )

وەڵامم دايەوە : (هيچ مەڵێ. بخوێنەرەوە. ) پەڕاوەكانم لە كۆشم دەرهێناو و پێمدا.

تەواوى عەسر، بەسەر سوڕمانەوە لە ئاوى پيدرام ئەڕوانى. ئافرەتەكە لەفە و شەرابى بۆ هێناين، شتێكى سەبارەت بە ڕۆژگار ووت، وە ديسان بە تەنها جێى هێشتين. جارێكى تر دەستى لە خوێندنەوە هەڵگرت، وە نيگاى لە دووريیەكى زۆرەوە وون بوو، نوقمى ئەندێشە بوو بوو.

سەرئەنجام بڕيارمدا لە جەنگەڵ، لە دەورو بەرى فوارە بچووكەكان، بە تێڕوانينەوە هەنگاو هەڵگرم كە لێوان لێو لە ڕابردوو واتا بوون. كاتێ هەتاو بەرەو نيشتن چوو، دووبارە گەڕامەوە بۆ لاى.

کاتێ پەڕاوەکانی بە من ئەدا، ووتی: (سوپاسگوزارم. وە داوای لێبوردن ئەکەم.)

له کەناری ڕووباری پیدرا دانیشتم بە زەردەخەنەوە.

درێژەی پێدا: (ئەوینی تۆ منی ڕزگار کرد و ڕوو بە خەونەکانم هێنامیەوە.)

بە ئارامی مامەوە و نەجولام.

پرسیاری کرد: (زەبور 137* دەزانی؟)

سەرم بە شێوەی نەخێر تەکاندا. دەترسام قسە بکەم.

ـــــ (له کەناری ڕووباری بابل.....)

ووتم: (بۆچی، بۆچی، دەزانم.) هەستم ئەکرد کەم کەم ڕوو بە ژیان ئەگەڕێمەوە؛ (دەربارەی کۆچ کردن و جیابوونەوە ئەدوێت.

* زەبور: کتێبی پیرۆزی حەزرەتی داود.

سەبارەت بە کەسانێك ئەدوێت کە ئاوێزانی پەیوەستەکانیانن، چونکە ئیتر ناتوانن ئاهەنگێك لێبدەن کە خۆیان ئەیانەوێت. )

ــــ ( بەڵام لە دوای ئەوەی کە زەبور نوس لە خەمی تاراوگەی سەر زەوی خەونەکانیدا دەستی بە گریان کرد، بەڵێن بە خۆی ئەدات کە:

ئەگەر ئەی قودس "ئورشلیم" تۆ لە یاد بکەم،

دەستی ڕاستم فەرامۆشم بکات.

زمانم بە چێژمەوە بلکێت

ئەگەر ئوریشم لە هەموو شادییەکانمدا بەشدار نەکەم. )

جارێکی تر زەردەخەنەم کرد.

ووتی: ( خەریك بوو فەرامۆشم ئەکرد تۆ دیسانەوە بە بیرت هێنامەوە. )

پرسیارم کرد: ( وا دەزانی خەڵاتەکانت بگەڕێنەوە؟ )

ــــ ( نازانم. بەڵام خودا لە ژیاندا هەمیشە هەلی دووبارەی پێ بەخشیووم. وە تۆ دووبارە بە من دەبەخشێتەوە.. وە یارمەتیم ئەدات دووبارە ڕێگەکەم بدۆزمەوە. ) دووبارە قسەکەیم پێ بڕی: ( ڕێگەی ئێمە. )

ــــ ( بەڵێ، ئێمە. ) دەستی گرتم و بەرزی کردمەوە.

ووتی: ( بڕۆ پێداویستیەکانت کۆ کەرەوە. تەنها خەونەکانن زەحمەت دەکێشن. )

